# دیسان ئیدیەم
# پێداچوونەوەیەك لەبەر ڕۆشنایی زمانەوانیدا

محمد معروف فتـــاح

لە بەرگی پازدەهەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ
دەستەی کورد دەرهێنراوە

بەغـدا ـ ١٩٨٦

# دیسان ئیدیەم
## پێداچوونەوەیەک لەبەر ڕۆشنایی زمانەوانیدا

**محمد معروف فتاح**
**ماموستا لە بەشی ئینگلیزی**
**زانکۆی سەلاحەدین**

**١ ـ پێناسەی دیاردەکە :**

زاراوەی ئیدیەم تائێستا بە چەند واتایەکی جیاجیا لە ڕێزماندا بەکارهاتووە • هەندێ جار بە واتای زمانی کۆمەڵە خەڵکێك دێ[١]و زۆر جاریش ئەو دەربڕینانە ( تعابیر ) دەگرێتەوە کە بەتایبەتی لە زمانێکی یان شێوە زمانێکی دیاریکراودا هەن‌و ئەو زمانە یان شێوە زمانە لەوانیتر جیادەکەنەوە[٢] • نزیکترین پێناسە کە لەگەڵ مەبەستو تێڕوانینی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بگونجێت ئەم پێناسەیەی خوارەوەیە[٣] :

ئیدیەم بریتییە لەو تێکەڵی‌و تێکچڕژانەی کە ئاسایی دوو وشە یان زیاتر پێکی دێنن • ئەو واتایەی کە دێتە کایەوە ( لەئەنجامی ئەو تێکەڵییەوە ) لە واتای کەرتەکانەوە یان لە پەیوەندی ڕێزمانی ئەم کەرتانەوە پێش بینی ناکرێت •

ئەم پێناسەیە دوو پێوانەی ڕوونمان دەداتێ بۆ ناسینەوەی ئیدیەم :ـ

( ١ ) ئیدیەم لە رووی ڕۆنانەوە ناسادەیە ، بە واتای ئەوەی لە رووی ڕێزمانەوە لە دوو کەرت یان زیاتر پێك دێت •

( ٢ ) ئیدیەم بە پێی ئەم پێناسەیە بێ هاوتایە ، بە واتای ئەوەی واتای ئیدیەم لە ڕۆنانی ڕێزمانی‌و ڕۆنانی واتایی کەرتەکانەوە نایەت یان ، بە

واتایەکی تر ، واتای ئیدیەم تارادەیەکی زۆر پەیوەندی بە واتای کەرتە پیك هێنەرەکانیەوە نی‌یەو لەمانەوە واتای ئیدیەمەکە نادۆزرێتەوە • بەم‌پێ‌یە ، فریزی « دووزمان »و « بە دەست » لە رستەی یەکەمدا ئیدیەمن ؛ بەڵام لە رستەی دووەمدا بە ئیدیەم دانانرێن لەبەر نەبوونی مەرجی دووەم :

( ۱ ) ا ــ حەز لە مرۆڤی دوو زمان ناکەین • ( فتنە ) •
ب ــ دوو زمان دەزانێ •

( ۲ ) ا ــ پیاوێکی بەدەستە • ( بەدەسەلاتە ، دەست‌روییوە ) •
ب ــ بە دەست نامەکەی نووسی • ( چاپی نەکرد ؟ ) •

هەندێ زمانەوان پیناسەی ئیدیەم وا فراوان دەکەن کە مۆرفیم‌و گوتنیش بگرێتەوە • هەرچەندە ئەمانە مەرجی دووەمیان تێدایە لە هەڵکەوتدا ، بە واتای ئەوەی بێ‌هاوتان یان واتاکانیان پێش بینی ناکرێ[٤] ، بەلای ئێمەوە چاك وایە سوور بین لەسەر بوونی مەرجی یەکەمیش‌و مۆرفیم بە ئیدیەم دانەنێین تاوەکو بتوانین سنووری ئیدیەم بەرێکی بکێشین‌و لە دانە رێزمانیەکانی‌تر جیای بکەینەوە • بەم پێ‌یە ، لەم لێکولینەوەیەدا ئیدیەم بەو دەربڕینانە دەوترێ کە فرە کەرتن بەڵام لە رووی واتاوە کەرت ناکرێن ( بێ‌ئەوەی واتاکە بشێوێ ) •

بەپێ‌ی ئەم بۆچوونەمان ئیدیەم بە دانەیەکی واتایی دادەنرێ‌و پەیوەندی « نواندن » دەیبەستێتەوە بە دانە رێزمانەیی‌یەکانی‌ترەوە[٥] • لەبەرئەمەیە کە ئیدیەم هەندێ جار بەهۆی فریزەوە دەردەبڕرێ‌و هەندێ جاریش دانەی لەمە گەورەتر دەینوێنێ ( وەك گوتن یان رستە ) • بۆنموونە هەموو ئەم کەرەسە زمانی‌یانەی خوارەوە ، بەپێ‌ی ئەم بۆچوون‌و پیناسەیەمان بە ئیدیەم دادەنرێن هەرچەندە لە رووی رێزمانیەوە دەبن بە چەند پۆلێکی جیاوازەوە :
۱ ــ ئیدیەم ( لە شێوەی وشەی لێکدراودا ) •

چاوچنۆك ، گوێ لەق ، دەستبڵاو ، زماندرێژ •

٢ ــ ئیدیەم ( لە شیوەی فریزدا ) •

مانگابەکەڵ ، چاولەدەر ، ئەسپێی کراسەکۆن •

٣ ــ ئیدیەم ( لە شیوەی رستەدا ) •

باڵی لێ پەیدابووە •
ئاویان کردە ژێر •
پارووی گەورە دەگلێنێت •
بە شووی داوێ •

ئەم نەخشـــەیەی خـــوارەوە پەیوەنـدی ئیدیـــەم لەگـــەڵ دانـــە ڕێزمانییەکانی‌تردا دەردەخات :




٢ ــ سنووری ئیدیەم :

٢ ــ ١ ئیدیەم‌و فریز :

چاکی ئەو پیناسەی سەرەوە لەوەدایە کە بەئاســانی ئیدیەم لە فریـــز جیادەکاتەوە • هەرچەندە ئیدیەم لە ڕۆنانی ڕێزمانیدا لە فریز دەچێت ( لـــە

رواڵەتدا ) ، بە واتای ئەوەی هەردووکیان فرەکەرتن ، لـە زۆر رووەوە ئیدیەم لە فریز جیادەبێتەوە :

ـ فریز رێگەی ئەوە دەدات وشەی تر بەکاربێت لەجێی کەرتەکانی خۆی بێئەوەی واتا گشتیەکە بگۆڕێت یان ئەو گۆڕینە کارکاتـە سـەر کەرتەکانیتر ، هەرچەندە ژمارەی ئەو گۆرینە رێزمانیانەی کـە ئیدیـەم رێگایان دەدات بۆنموونە ، لە فریزی « لە ماڵەوە » دەیان وشـە دەتوانێ جێگەی « ماڵەوە » بگرێت ( لـە رووی تیوریەوە دەتوانـین بڵێین هەموو ناوێك بەمەرجێ شوێن پیشان بدات دەتوانێ بێتە ئەم چوارچیوەیەوە ) وەك « دەرەوە » و « ناوەوە » و « ژوورەوە » ؛ بەپێچەوانەوە ، لە ئیدیەمدا ئەم گوڕینانە یان نابێت ( وەك لە ئیدیەمی « چنگ لەسەر شان » دا دەبینین ) یان لە سنووریکی زۆر تەسکدا دەبێت ( وەك لە ئیدیەمی « شوولی لێ هەڵبڕی » کە دەتوانین نەك هەر راناوەکە بەڵکو کەرتی دواوەیشی بگۆڕین بێئەوەی ئیدیەمەکە بشێوێ ! شووڵت لێ هەڵبریوە ، شووڵیان لێهەڵکێشاوە ٠

٢ ـ لە فریزدا ئاسایی هەر وشەیە واتای سەربەخۆی خۆی هەیـە و ئەو زانیاری‌یەی فریزەکە دەیگەیەنێ بەرەبەرە وشـە لەدوای وشـە لـە زیادبووندایە تا دواکەرتی فریزەکەو هەر وشەیە کار لەوەی پێشـەوەی دەکات ٠ بۆنموونە لە فریزێکی وەك « ئەم سەرزەمینە پانو بەرینە » هەموو کەرتەکان ( ئەم ، پان ، و بەرین ) واتای ( سەرزەمێن ) دیاری دەکەنو تـا نەگەینە دوایی فریزەکە بەتەواوی تێناگەین لە چی سەرزەمینێك دەدوێنو مەودای ئەوەشمان هەیە تا کۆتایی شتێك بڵێین کە گوێگر بەتەمای نەبێ ( وەك : ئەم سەرزەمینە پانو بەرینو پر لە ئاشووبە ٠٠٠٠٠٠ ئەم سەرزەمینە پانو بەرینو پۆخلە کە ٠٠٠٠ ) ٠ لە ئیدیەمدا ، بە پێچەوانەوە ، کەرتەکان واتای سەربەخۆی خۆیان نی‌یە ، بەڵکو وازیان لە واتا بنەرەتیەکانی خۆیان هیناوە لەپێناوی ئەو تیکەڵیو تێکچرژانە کە پێکیدەهێنن ٠ لەبەرئەمـە

ناتوانین بڵێین لە ئیدیەمدا وشە لەدوای وشە زانیاریمان زیاد دەکات ، بەڵکو کە گەیشتینە کۆتایی ئیدیەمەکە ئەوسا واتایەکی ئامادەکراومان دێتە دەست • بە واتایەکی‌تر ، تا دەگەینە کۆتایی دواکەرتی ئیدیەمەکە ، ناتوانین پێشەکی واتای دانەکە بزانین • لەم تایبەتی‌یەدا ، ئیدیەم لە وشە دەچێت ؛ هەردووکیان دانەی ئامادەن لە زمانداو پیویستیان بەوەیە لە فەرهەنگدا تۆمار بکرێن[٦] •

٣ ـ لەبەرئەوەی کەرتەکانی ئیدیەم زۆر لەگەڵ یەکتریدا دێن‌و لە پاڵ یەکتریدا دەبینرێن‌و تێکەڵیەکی تەواویان لە نێواندا هەیە زۆربەی قسەکەرانی زمانەکە دەتوانن ئیدیەمەکە تەواوکەن هەر کە کەرتێکیان گوێ لێ بوو • بۆنموونە ، قسەکەرێکی کوردی بەئاسانی دەتوانێ ئیدیەمێکی وەك « ملی شکاند » یان « چاوبەستی لێ کرد » تەواو بکات هەر کە کەرتی یەکەمی درایە • بە واتایەکی تر ، تێکەڵی کەرتەکانی ئیدیەم ئەم توانایە دەدات بە قسەکەر کە بتوانێت پێش بینی کەرتەکانی‌تر بکات ، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە ژمارەی ئەو کەرتانەی کە لەو چوار چیوەیەدا دێن کەمن • بەپێچەوانەوە لە فریزی ئاسایی‌دا ( بەرەڵا ) قسەکەر ناتوانێ پێشەکی بۆ کەرتەکان بچێت چونکە ژمارەی ئەو کەرتانەی کە بەتەمایەتی ولەو چوارچیوەیەدا دێت بێ‌سنوورەو بەراورد ناکرێ لەگەڵ ژمارەیان لە ئیدیەمدا • بۆنموونە لە چوارچیوەی « بۆ •••••• »دا سەدان وشەی کوردی جێگەی دەبێتەوە ، بەڵام لە چوارچیوەی « شووڵی لێ •••••• » ، تەنیا چەند کارێك جێگەیان دەبێتەوە ئەوەی یەکەم جار بەبیردا دێ « هەڵکێشاوە » یان « هەڵبڕیوە »یە ، چونکە ئەم کۆمەڵە وشەیە زۆر لەگەڵ یەکتریدا دێن‌و هاوریەتی‌یان گرتووە •

٤ ـ یەکیەتی‌یەکی واتایی یان تایبەتیەکی واتایی لە ئیدیەمدا هەیە کە لە فریزی ئاسایی‌دا نی‌یە[٧] • بۆنموونە ، « بەخێرایی » و « بەپەلە » فریزن بەڵام « چنگ لەسەر شان » ( هەر چەندە لەواتاو رۆناندا لەگەڵ

ئەمانەداجیاناکرێتەوە ) بە ئیدیەم دادەنرێ چونکە کەرتەکان بە هەموویان واتایەکی تایبەتیمان دەدەنێ کە هیچ پەیوەندییەکی بە واتای « چنگ »و « لەسەر شان »ەوە نیە • ئەم یەکیەتی واتایە زیاتر لەوەدا دەردەکەوێ کە ناتوانین هیچ کەرتێك لەم کەرتانە لابەرین یان بیگۆڕین بێ‌ئەوەی واتای ئیدیەمەکە بشێوێنین • تەنانەت رێگەی ئەوەشمان نی‌یە وشەی هاوواتاش بخەینە جێگەی کەرتەکان وەك ئەو نموونانەی خوارەوە بۆمان دەردەخەن •

(١) چنگ لەسەر شان = زۆر بەخێرایی

- قۆل لەسەر شان •
- دەست لەسەر شان •
- مەچەك لەسەر شان •
- باسك لەسەر شان •
- چنگ لەبان شان •
- قۆڵ لەبان شان •
- مەچەك لەبان شان •
- چنگ لەسەر مل •
- چنگ لەسەر دەفەی شان •
- چنگ لەسەر شانی راست •
- چنگ لەسەر پشت •

به پێچەوانەی ئەمەشەوە ، لە فریزی بەرەڵادا (ئەوانەی کە ئیدیەم نین ) یەکیەتی واتایی نی‌یە • لەبەر ئەمەیە کە دەتوانین بەئاسانیو بەپێی خواستو ئارەزووی خۆمان کەرتەکان بگۆڕینو پاشو پێشیان پێ‌بکەین بێ‌ئەوەی

واتای فریزەکە بشێوێنین وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا بومان دەردەکەوێ .

بەخێرایی ( خۆی کرد بە ژوورەکەدا )

بەپەلە ..................................................

بەڕاکردن ..........................................

بە قەڵەمباز

بە پەرۆشەوە

بە هەنگە شەلێ ............................................

بە سواری یەوە ............................................

بە پاسکیلەکەیەوە ......................................

بە هەڵەداوان

۲ ــ ۲ ئیدیەمو وشە :

لە رواڵەتدا ئیدیەمو وشەی لێکدراو لە چەند روویەکەوە لــە یەکتر دەچن :

(۱) ئیدیەم دانەیەکی وشە ئاساییە ، بە واتای ئەوەی ئیدیەم وەك وشە هەڵسوکەوتدەکات . بەڵگەمان بۆ ئەم راستی یە ئەوەیە کە وشە زۆر جار دەتوانێ جێگەی ئیدیەمێك بگرێتەوە بێ‌ئەوەی واتای رستە تێك بدات :

۱ ــ دنیا کشو ماتە ( ئیدیەم )

۱َ ــ دنیا خامۆشە ( وشەی سادە )

۲ ــ ئەو دوانە دڵیان بەیەکترەوەیە ( ئیدیەم )

۲َ ــ ئەو دوانە حەزیان لەیەك کردووە ( وشەی لێکدراوە )

٣ ــ دیمەنێکی دڵفرێنە ( ئیدیەم )

٣َ ــ دیمەنێکی جوانە ( وشە )

٤ ــ لاوێکی دڵقایمە ( ئیدیەم )

٤َ ــ لاوێکی ئازایە ، نەترسە ( وشە )

بەڵگەیەکی‌تریش بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئیدیەم وشەئاسایە لەوەدایە کە ئیدیەم وەك وشە یەکیەتیەکی رۆنانی لەنێوان کەرتەکانیدا هەیـە[٨] • دیسانەوە وەك وشە رێگە نادات بە کەرەسەی‌تر بچێتە نێوان کەرتەکانیەوەو لە یەکتریان دووربخاتەوە • بۆنموونـە ، هـەروەك چۆن وشـە رێگەی کەرەسەی‌تر نادات بچێتە نێوان مورفیمە پێك هێنەرەکانیەوە[٩] ( چاکتر : * چاك نەتر ) ئیدیەمیش هەمان ئارەزووی خۆپاراستن‌و خۆ جیاکردنەوەی لـە کەرەسەی‌تر تێدا بەدی‌دەکرێ • ئەم دەربڕینانەی خوارەوە لەبەر لادان لەم یاسایە لە رووی رێزمانەوە بەهەڵە دادەنرێن : ــ

(١) لەش بە بار ( نەخوش )

* لەش زۆر بە بار      * لەش نە بەبار

(٢) پایزە برا

* پایزە گەورە برا      * پایزە زۆر برا

(٣) ئەسپیی کراسەکۆن

* ئەسپی‌یەکی گەورەی قەڵەوی کراسەکۆن

(٢) وشەو ئیدیەم هەردووکیان بە ئامادەکراوی هـەن‌و دەخرێنـە گوتنەوە • بەواتایەکی‌تر ، وشەو ئیدیەم لەم کەرەسـانەن کـە واتـای فەرهەنگی‌یان هەیەو پیویستیان بەوە دەبێت لە فەرهەنگدا تومار بکرێن‌و واتاکانیان روون بکرێتەوە[١٠] • لەم رووەوە ، بەپیچەوانەی فریزو وشەی

لێکدراوەوە رەفتار دەکەن چونکە ئەمانە پێویستیان بە تۆمارکردن نیە لە فەرهەنگدا چونکە بەئاسانی لە واتای کەرتەکانو پەیوەندییە ریزمانیەکەوە (بەستن یان لێکدان) دەتوانین واتای فریزەکە یان وشە لێکدراوەکە هەڵبێنین • بە پێچەوانەوە ، ئیدیەمێکی وەك « کونە بـا » یان « لـــە گوێی گادا نوستووە » ، هەرچەندە لە رووی رێزمانیشــەوە شیبکرێتـەوەو کەرتی وردتریان لێدەربێت ، لەبەر ئەوەی کەرەسەی ئامادەکراون ، ئەمشیکردنەوەو کەرت کردنە ئەوەمان ناداتێ لە واتاکانیان بگەین • لەبەر ئەوە دەبێ لــەم رووەوە ئیدیەم وەك مۆرفیم سەیربکرێتو شینەکرێتەوە بۆ کەرتی وردتر ، ئەگینا واتاکەی دەشێوێ[11] • هەر لەبەر ئەمەشە لە زۆربەی فەرهەنگەکاندا ئیدیەم وەك وشە بە دانەیەکی زمانی دادەنرێ • لە دوو سەرەوە وشە لە ئیدیەم جیا دەبێتەوە :

**١ ـ لە رووی رێزمانەوە :**

وشە لە مۆرفیمێك یان زیاتر پێكدێت بەڵام ئیدیەم لە چەند وشەیەك • بونموونە ، « ئاگردان »کە وشەیەکی لێکدراوە ، لە مورفیمی « ئاگر »و « دان » پیكهاتووە ، بەڵام ئیدیەمی « ئاگری بنکا » لە وشەی « ئاگر »و «بن»و «کا» راستەوخۆ پیكهاتووە • بە واتایەکیتر کەرتە پیكهێنەرەکانی ئیدیەم هەموویان دەتوانن جارێکیتر سەربەخۆ بەکاربێنەوە *[12] • هەرچی کەرەسە راستەوخۆکانی وشەیە ، هەندێکیان سەربەخۆ بەکاردێنەوە ، بەڵام هەندێکیتریان ( مۆرفیمە بەندەکان ) بەتەنیا هەر خۆیان بەکار نایەنەوە ، بەم جۆرە دەتوانین بڵێین وشە شیدەکرێتەوە بۆ دانە ( یەکە ) کە لەوە زیاتر کەرت ناکرێت بەڵام ئیدیەم شــیدەکرێتەوە بۆ کەرەسەی لێکدراو کــە زۆربەیان جارێکی تریش شــی دەکرێنەوە ( وەك دانەی « ئاگری » کــە دیسانەوە دەبێت بە دوو مۆرفیمەوە « ئاگر » لەگەڵ « ـ ی » نیشانەی ئیزافە • بروانە نموونەکەی سەرەوە •

ب ـ له رووی واتاوه :

وەك لەپێشترەوە روونمانکردەوە له واتای کەرتەکانی وشـــەیەکەوە دەتوانین پێش‌بینی له واتای وشەکە بکەین بۆنموونه ؛ كه واتای « پیاو »و « چاك »مان زانی دەتوانین واتای « پیاوچاك » بزانین بێئەوەی پێویستمان به فەرهەنگ بێ • بەپێچەوانەی ئەمەشەوە ، واتای کەرتـــەکانی ئیدیـــەم یارمەتیمان نادات بۆ هەڵ هێنانو دۆزینەوەی واتای ئیدیەمەکە ، بەڵکو هەندێ جار دەبێتە هۆی سەرلێتێكدانو بزرکردنی واتـــاکە چونـــکه کەرتەکان لەپێناوی هێنانه دی ئەو ئیدیەمەدا زۆر جار یان بەتەواوی وازیان له واتاکانیان هێناوە یان هەندی رووی واتاکانیان خستۆته لاوە • لەم رووەوە لێکچوونێك لەنیوان « مەرەکەبی کیمیاوی »(١٣)و « ئیدیەم »دا بەدیدەکرێ • هەروەك چۆن توخمی هایدرۆجین وتوخمی ئۆکسجین وازیان له هەندێ‌تایبەتی خۆیان هێناوە له پیك‌هێنانی مەرەکەبی «ئاو»دا ، هەروەها وشەیەکی وەکو «کون»و وشەیەکی وەك « بـــا » وازیان له هەندێ لایەنی واتا بنەرەتیەکانی خۆیان هیناوە بۆ پێك‌هێنانی ئیدیەمێکی وەك « کونە با » • لەبەر ئەمەیـــه کـــه شی‌کردنەوەی ئیدیەمەکه بۆ « کون » و « با » ناماندگەیەنێته واتای ئیدیەمەکه بەڵکوئەگەر واتای « کون » و « با » مان نەزانیایه ، رەنگه بەئاســـانی‌تر فێری واتای « کونەبا » ببووینایەو کەمتر لێمان تێك‌بچوایه یان لەبیرمان بچوایەوە • واتای ئیدیەمەکه که مرۆڤێکی پر له هاشەو هووشەو هیچ لەبارا نەبوو دەگرێتەوە هیچ پەیوەندی‌یەکی به واتای وشەی «کون»و «با»وە نی‌یه چونکه لێرەدا « کون »که به واتای ( سەر چاوە ) دێتو وازی له واتـــا بنەرەتیەکەی خۆی بەتەواوی هێناوە • هەروەها وشەی « با »ش که لەبنەرەتدا به واتای « هەوایەکی جوڵێنەر »دێ وازی له زۆر لایەنی ئاساییەکەی خۆی هێناوەو لێرەدا زیاتر کاری با لەسەر دەوروبەرو ئەو هاشەو هووشەیەی کەبەهۆیەوە هەست به بوونی با دەکرێ دراوەته بەر رۆشـــنایی‌و تاکیدی کراوەته سەر • به واتایەکی‌تر ، له ئیدیەمی « کونەبا »دا « با » به واتای ئەو

هاشەو هووشەیە دێ کە لەبنەرەتدا بەشێکی گرنگ نییە لەو وشەی « با »
بەهۆیەوە پیناسە ناکرێ • بێ‌گومان واتاکە لەمەشەوە گۆراوە بۆ هاشەوهووشەی بێ سوود یان قسەی هیچ‌وپووچ • ئیدیەمەکە یان مەرەکەبە کیمیاوێکە بە واتای « کەسێك کە سەرچاوەی قسەی پروپووچ بێت » دێت • بەم‌جۆرە دەبینین نەك هەر کەرتەکانی ئیدیەمەکە لەپێناوی ئیدیەمەکەدا واتای خۆیان ناوەتەلاوە بەڵکو مەرەکەبە کیمیاویەکەش لەئەنجامی یەکگرتنی کەرتەکان واتای‌تری بۆ خۆی سەندووە کە لە کەرتەکانەوە نەهاتووە • لیرەدا ئەو واتا زیادەیە ئەوەیە کە ئیدیەمەکە بێ‌ئەوەی هیچ گرەیەك وەرگرێ ، ئەرکی ریزمانیشی گۆراوە لە ناوێکی بەرجەستەوە بووە بە ناوێکی بکەر ؛ چونکە ئیدیەمەکە بە واتای « ئەوکەسەی کە •••••• » دێ • لە کاتی‌تردا زمانی کوردی بۆ دەربرینی ئەم ئەرکە پاشگر بەکاردێنێ وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ •

کرێکار ( کرێ + کار ) = ئەوکەسەی بە کرێ کار دەکات

جووتیار ( جووت + یار ) = ئەوکەسەی کە زەوی دەکێلێ •

ئاسنگەر ( ئاسن + گەر ) = ئەوکەسەی کە بە کاری ئاسنەوە خەریکە

کوونەبا ( کون + با + • ) = ئەوکەسەی کە سەرچاوەی قسەی هیچ‌و پووچە •

**٢ ــ تایبەتیەکانی ئیدیەم :**

لەدوای ئەوەی پێناسەیەکی وردی ئیدیەممان کردو بەوردی لە وشەو فریزمان جیاکردەوە وپەیوەندیمان لەگەڵ ئەم کەرەسە زمانیانەدا دەرخست ، دەتوانین لە سێ خاڵدا تایبەتیەکانی ئیدیەم دیاری بکەین •

١ ــ واتای ئیدیەم لە کۆی واتای کەرتەکانی گەورەترە :

وەك لە بەشی یەکەم‌و دووەمی ئەم لێکۆلینەوەیەدا روونکرایەوە ئیدیەم

بریتی‌یە لەو زنجیرە وشەیەی کە واتاکەی لە واتای کەرتەکانی گەورەترە لەوەدا کە واتای ئەم بەشانە نامان‌باتە سەر واتای ئیدیەمەکەو توانای دۆزینەوەی واتاکەیمان ناداتێو هەندێ جار رێگەشمان لێ هەڵە دەکات • بۆنموونە ، زانینی واتای (« کەوڵ » = پێست )و ( کۆن نوێ ) یاریدەمان نادات بۆ لێکدانەوەی واتای ئیدیەمی ( کەوڵەکۆن ) چونکە بە واتای (« پێستێکی کۆن » ) نایەت وەك رۆنانە رێزمانیەکەی دەری‌دەخات ( ناو + ئیزافە + ئاوەڵناو ) بەڵکو بە واتای « کەسێکی پیری پەك‌کەوتە » بەکاردێت • ئەم واتایەشی پەیوەندی‌یەکی زۆر کەمی بە واتای کەرتەکانەوە هەیە چونکە « کۆن » لێرەدا بە واتای « بەتەمەن » بەکارهاتووەو زیاتر لە « پیر » نزیك‌بۆتەوە • ( کەوڵ ) یش بۆتە ( نسبة ) بۆ مرۆڤ کە شتێکی زۆر نائاسایی‌یە لەبەرئەوەی (کەوڵ) لە کاتی ئاسایی‌دا بۆ «مرۆڤ» بەکارنایەت • جگە لەمەش گۆڕاتێك لە پۆلی ناوەکەدا رووی‌داوەو لە ناوێکی بەرجەستەوە گۆڕاوە بۆ ناوی بکەر « ئەوکەسەی کە .... » هەموو ئەم گۆرانکاری‌یە پێکەوە وامان‌لێ‌دەکات کە ئیدیەم وەك وشەیەکی نوێی ئامادە سەیر بکەین‌و بە واتاو فۆرمەوە لەبەریان بکەین کاتێ کە زمانێکی بێگانە فێر دەبین • بە واتایەکی‌تر ئیدیەم وەك هەموو مۆرفیم‌و وشەیەکی سادە لە رووی واتاوە هێمایەکی « تاریکە »و*(١٤) بەمە لە وشەی لێکدراوو فریز جیادەبێتەوە کە کەرەسەی رونن لە زماندا •

٢ ــ ئیدیەم سەرکەشەو کەم خۆی دەدات بەدەست یاسای گۆڕانکاری‌یەوە • یەکێك لە تایبەتی‌یەکانی ئیدیەم لەوەدایەکە سەرکەشەو سەرپێچی لە زۆربەی یاسا گۆرانکاریەکان دەکات • هەر لەبەرئەمەشە کە ئیدیەم بۆتە یەکێك لەو بابەتانەی کە زۆربەی زمانەوانەکان ( سەر بە هەر قوتابخانەیەك بن )(١٥) دوورە پەرێز لێی دەوەستن‌و خۆیانی لێ گێل دەکەن‌و نایانەوی پێیەوەی خەریك بن • ئەم سەرکەشی‌یەی ئیدیەم لەوەدا دەردەکەوێ کە زۆر جار فۆرم‌و رۆنانی نزیك خۆی لێوی لێوە وەرناگیرێ •

یاسا گۆڕانکاری‌یەکان بە شێوەیەکی گشتی دەبن بە سێ چەشنەوە :

١ ــ یاسای ئاسانکاری کە ئەو یاسا زمانیانە دەگرێتەوە کە بەهۆیەوە دەمانەوێ لە دووپات‌کردنەوەی کەرەسەیەکی زمانی رزگارمان بێت • ئەم چەشنە یاسایە لە دوو شێوەدا دەبینرێ (١) ئەو یاسایانەی کە کەرەسەی دووپات‌کراو دەسڕنەوە (٢) ئەو یاسایانەی کە کەرەسەکە دەگۆڕنەوە بە کەرەسەی کورتتر لە خۆی • بۆنموونە ، رستەیەکی وەك « نازانم کەی بێم بۆ لات » لە « من١ نازانم من٢ کەی بێم بۆ لات »ەوە وەرگیراوە بەهۆی سڕینەوەی ڕاناوی « من٢ »ەوە کە دوو پات‌بۆتەوەو بۆ هەمان کەس ( من١ ) دەگەڕێتەوە • بە هەمان شێوە بەکارهێنانی یاسای ئاسانکاری ( چەشنی یەکەم سڕینەوە ) لە رستەی دووەمدا لە دووپات کردنەوەی منالەکان ( رستەی یەکەم ) رزگارمان دەبێ :

(١) منالەکان لەسەر شەقامەکە یاری دەکەن !

(٢) بچۆ بیانهێنەوە

٢ ــ یاسای ئاخنین :

بەو یاسایە ئەوترێ کە هەندێ کەرەسەی زمانی دەئاخننە ناو رستەیەکەوە • ئاسایی ئەم کەرەسانە لە رووی واتاوە بەتاڵن‌و زیاتر ئەرکی رێزمانی دەبینن وەك ئەو یاسایەی کە پاشبەندی ( ە ) بە دوای ئاوەڵناوی ئیشارەوە دەلکێنن لە کوردیدا :

( ئەو پیاو ← ئەو پیاوە ) یان ئەو یاسایەی کە ( ی )ی ئیزافە دەئاخننە نیوان دوو ناو یان ناوێك‌و ئاوەلکارێك یان ناوێك‌و ئاوەڵناوێك گەرماو شیرین ← گەرماوی شیرین ، پیاوەکە بەر دەرگا ← پیاوەکەی بەر دەرگا ، کوڕ ئازا ← کوڕی ئازا ) •

۳ ــ یاسای پاش وپێش کردن :

ئەو یاسایانەن کە شیوەی ریزبوونی کەرەسەکانی رستە دەگۆڕنو هەندێ کەرەسە پاش یان پێش ئەوانیتر دەخەن وەك ئەو یاسایانەی کە لارستە دێننە پێش شارستەوە یان هەندی ئاوەڵناو دەبەنە پێش ناوەوە یان ئامرازی پرسیار دەبەنە پێش رستەوە وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

(۱) من نایەم تاتۆ نەڵێیت ← تا تۆ نەڵێیت من نایەم

(۲) شیلان دوینێ گەیشتە جێ ← کەی شیلان گەیشتە جێ ؟

(۳) پیازی تەڕ ← تەڕە پیاز

(٤) کاڵەكو شووتی ← شووتیو کاڵەك

(٥) برۆ تا نەهاتوون بەدواتا ← تا نەهاتوون بەدواتا برۆ ٠

ئەم یاسایانە کە بەسەر هەموو فرێزێکی ئاسایی‌دا جێبەجێ دەبن ، لەگەڵ زۆربەی ئیدیەمدا ریكناکەون ٠ جگە لەمەش هەر ئیدیەمە لەگەڵ جۆرێك لەم رستانەدا دەرواو تەنانەت تا هەر ئیدیەمە تاکە تاکە وەرنەگرینو هەوڵی ئەوە نەدەین یاساکانی بە سەردا جێبەجێ بکەین نازانین کام یاسایە لەگەڵ کام ئیدیەمدا ریكدەکەوێ ٠ بۆنموونە ، هەندی ئیدیەم رێگە بە یاساکانی تێ‌ئاخنینو ئاسانکاریو پاشو پێش کردن دەدات وەك :

١ ــ لە گوێی گادا نووستووە ( = ئاگای لە دنیا نی‌یە )

ا ــ بۆ من لە گوێی گادا نووستوم ! ( تێ ئاخنین )

ب ــ کاکە ( ئیوە ) ئەوان لە گوێی گادا نووستوون ( تێ‌ئاخنین )

ج ــ دەزانێ ( دەزانیت )لە گوێی گادا نەنووستوم ٠

۲ ــ زمانلووس

پیاوێکی زمانلووسە

پیاوێکی چەند زمانلووسە ( زمانلووس بوو ) ( تێئاخنین )

تو سەیری چەند زمانی لووسە ( زمانت لووسە ) ( تێئاخنین )

زمانی زۆر لووسە (تێئاخنین )

زمانلووسی لە خۆی دێ •

٣ ــ ناوی بە گەرووی ئاشا چێت

ناوت/ناوتان/ناویان بە گەرووی ئاشا چێت ( تیئاخنین )

لە هەمان کاتیشدا هەر ئەم ئیدیەمانە خۆیان ڕێگە بە هەندێ چەشن لەو گۆڕانکاریانە نادەن(١٧) • ئەم ئیدیەمانەی خوارەوە هەموویان ناپەسەند بوون چونکە بەزۆر هەندێ یاسای گۆڕانکارییان بەسەردا جێبەجێ کراوە :

* کە تۆ هاتیت من لە گوێی گادا نووستبووم • ( تێئاخنین )
* ناوت بە گەرووی ئاشا نەچێت • ( تێئاخنین )
* ئەو ساڵە من لە گوێی گادا نەنووستبووم • ( تێئاخنین )
* ناوی بە گەرووی ئاشێکی گەورەدا چێت • ( تێئاخنین )
* لە گوێ ی گادا بنوو !
* ناوی بە گەرووی ئاشدا بەرە !
* زمانم نا لووسە

هەندی ئیدیەمیش هەن خۆیان بە دەست هیچ لەم یاسایانەوە نادەنو هەروەك خۆیان بێئەوەی فۆرم بگۆڕن دەچنە گوتنەوە وەك :

١ ــ ریس‌و گوریس بۆ من مەخوێنەرەوە

* گوریس‌و ریس ........

٢ ــ من تاقەتی ئەو راوە رێوی‌یەم نی‌یە

* من حەز لەم ڕاوەرێوی‌یە دەکەم

٣ ــ کەولەکۆن !

* کەولێکی کۆن .

٤ ــ کەوتۆتە ڕاورووت

* کەوتۆتە رووت‌و ڕاو

٥ ــ شەڕی خۆترێن دەکات

* شەڕی خەلك‌ترێن دەکات

٦ ــ شەل نی‌یەو پای شکاوە .

* شەل نیم‌و پام شکاوە .

٧ ــ لەم بەندو وباوە سەرم دەرناچێ

* لەم باوو بەندە سەرم دەرناچێ

* لەم بەندو باوە سەرم دەردەچێ

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بلێین ئیدیەم زۆر کەمتر لە فریزی ئاسایی خۆی دەدات بە دەست یاسای گۆرانکاری‌یەوە هەرچەندە ئەم سەرکەشی‌و سەرپیچیەی ئیدیەمیش لە ئیدیەمێکەوە بۆ یەکێکی‌تر دەگۆرێ[(١٨)] . هەندێکیان تەواو سەر کەشن‌و خۆیان بە دەست هیچ یاسایەکەوە نادەن ( وەك شەل نی‌یەو پای شکاوە ) ، هەندێکی‌تریان سەرکەشی‌و سەرپێچیان زۆر کەمەو خەریکن لە سروشتدا لە فریزی ئاسایی نزیك دەبنەوە ( وەك

زمان‌لووس ) • بەڵام بەشی زۆریان لەنێوان ئەم دوو پەڕەدا دەوەستن‌و هەندێ یاسا وەردەگرن‌و هەندێکیش ڕەت‌دەکەنەوە • ( وەك « دانی پیدا نا » کە دەتوانین دەستکاری راناوو نافی کاتەکەی بکەین ← دانم پێدا نەناوە ، دانیان پێدا ناوە ، دانی پیدا مەنێ ! بەڵام ناتوانین وەك کردارێکی لێکدراو کەرتەکانی پاش‌و پێش خەین ←

٣ ـ ئیدیەم بە واتا خوازراوەکەی زیاتر بەکاردێ‌و واتا پیتیەکەی بەرەو لەبیرچوونەوە دەڕوات :

ئاشکرایە کە زۆربەی ئیدیەم لە قۆناغی ئێستەیدا لە دوو شێوەدا دەبینرێت ، شێوەی ئیدیەمی ( ئەوەی واتاکەی خوازراوەو دوورە لە واتای کەرتەکانیەوە ) و شێوەی پیتی ( ئەوەی کە واتاکەی لە کۆی واتای کەرتەکانیەوە دێ‌و بێ‌یارمەتی فەرهەنگ واتاکەی ئەدۆزرێتەوە ) • بۆنموونە رۆناێکی وەك « سك‌سووتان » هەردوو بەکارهێنانەکەی هەیە وەك لەم نموونانەدا بۆمان دەردەکەوێ :

(١) وریا بە ، لە زۆپاکە نزیك مەکەوەرەوە با سکت نەسووتێ •
ئاگرەکە پرژایە ناو پشێتنەکەیەوەو سکی سووتاند •

(٢) نەکەی ئازاری ئەو پیرێژنە سك سووتاوە بدەی ، دوعای گیرا دەبێت •
ئافتاو : هەواری نوێتان پیرۆز بێت‌و تیا بحەسێنەوە !
فاتە : سکت نەسووتێ ! ( منداڵەکەت نەمرێ )

لە کۆمەڵی یەکەمدا رۆنانەکە فرێزێکی بەرەڵایەو واتاکەی لە « سك »و « سوتاندنەوە » بەدی‌دەکرێ‌و هەموو یاسا گۆرانکاریە رێزمانی‌یەکانی بەسەردا جێ‌بەجێ دەکرێت ؛ ( بەواتایەکی‌تر : دەکرێ بە پرسیار ، دەکرێ بە نەفی ، راناوەکانی دەگۆرێت بە هی‌تر ، وشەی‌تری تێدا ئاخنرێ وەك سکت سووتا ، ووریا بە سکت بە زۆپاکە نەسووتێ ، سکی زۆر سووتاوە ••••

ئاگادار نەبی سکت دەسووتێ ) لە کۆمەڵی دووەمدا ڕۆنانەکە ئیدیەمەو واتاکەی لە واتای کەرتەکانیەوە دوورەو زۆر یاسای گۆڕانکاری ڕەتدەکاتەوە ( *وریا بە سکت نەسووتێ ؛ سکی سووتا* ؛ سکت نەسووتێ ( بۆ پیاو )*[20] ... هتد ، دەبێ لەو ڕاستیەیە بگەین کە زمان تارادەیەك دەتوانێ ڕێگە بەم « بەرەلاّییە » بداتو بهێڵی هەمان ڕۆنان بە دوو واتای جیاواز یان زیاتر بەکاربێت . تا ژمارەی ئەم جۆرە ڕۆنانە پڕتەموژانە پتر بێت ، سەرلێتێكدان زیاتر دەبێو توانای زمانەکە کەمتر دەبێتەوە[21] . جا هەر لەبەر ئەمەشە کە ئیدیەم زیاتر بە واتا خوازراوەکەی بەکاردێو دەکەوێتە سەر زاری خەڵکیو بلاودەبێتەوە . لە زۆر کاتدا کە ئیدیەمەکە بە واتا خوازراوەکەی زۆر بلاو بوەوەو لەناو خەڵکیدا چەسپا ئیتر واتا تیپیەکەی بەرەو لەبیرچوونەوە دەڕواتو لەوانەیە پاش ماوەیەکی مێژویی لە زمانەکەدا دەژی بەلاّم شانبەشانی یەکتری بەکارنایەن . بەڵگەشمان بۆ ڕاستی ئەم باوەڕە ئەوەیە کە بۆ ڕوونکردنەوەو تێگەیشتنی واتای پیتی ئیدیەمێك پێویستمان بە دەوروبەر هەلبەستن زۆر دەبێت ، بەواتایەکیتر خەڵکی لە واتا خوازراوەکەی ئیدیەم زووتر تێدەگات وەك لە واتا پیتیەکەی ، هەرچەندە گوێگر زۆربەی کاتیش ئاگاداری هەردوو واتاکەیە بەوەدا کە زۆر جار کەڵك لەم بارە وەردەگرێو دەیکاتە سەرچاوەیەك بۆ نوکتە لە کاتی ئاخاوتندا[22] وەك بەم دوو نموونەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێ .

(١) — کاکە تۆ زۆرت تێ گووشیوە ؟

— ڕاستە ، وام دەزانی شلەکە لە دەستم ڕادەکات

. . . . . . . . . . .

(٢) — کوڕم گوێ مەدمرێ ، دنیا پێچی مێزەرێکە

— ئەی لەو پێچە وریابە وەر نەگەرێی

. . . . . . . . . . .

بۆ زیاتر روونکردنەوەی هەردوو واتای ئیدیەم ، واتای خوازراوو واتای پیتی ، وا لە خوارەوە هەندێ نموونە دەدەین

(١) کۆمەڵی یەکەم : بریتی‌یە لە کۆمەڵە ئیدیەمێك کە بە هەر دوو واتاکە دێن‌و لەسەر زارن

(٢) کۆمەڵی دووەم بریتی‌یە لە چەند ئیدیەمێك کە لەبەرئەوەی تەواو چەسپاون واتای پیتیان لەناوچووەو دەوروبەر هەڵبەستنیش ئەم واتایەیان زیندوناکاتەوە

(٣) کۆمەڵی سێیەم بریتی‌یە لە هەندی ئیدیەم کە زۆر جار دەبنە سەرچاوە بۆ نوکتە لەبەرئەوە گوێگر دەتوانێ خۆی بە ئارەزووی خۆی لە مەبەستی قسەکەر گێل بکات‌و بە واتا پیتیەکە وەری گرێ بە مەبەستی گاڵتەو پێکەنین

(١) کۆمەڵێ یەکەم

(١) حەوشەکەی خوارە !

= (١) بیانوومان پێ دەگرێ .
= (٢) حەوشەی ( خانووەکە ) خوارە .

(٢) زمانی سووتا

= (١) هەڵەی کرد
= (٢) زمانی بە چایەکە سووتا

(٣) پرچی سپی بهۆنێتەوە

= چاوەروانی بێهودە ئەگەر بەتەمای کۆشك‌و تەلار بێت دەبێ پرچی سپی بهۆنێتەوە

(٤) خۆی پێدا هەڵواسیوە

= (١) به مه‌رامێك خۆی له یه‌كێك نزیك ده‌كاته‌وه •
= (٢) مناڵه‌كه خۆی ( به لۆریه‌كه‌دا ) هه‌ڵواسیوه

(٥) له به‌ردی دا

= (١) فه‌وتانی ( پاره‌كه‌ی باوكی له به‌رد دا )
= (٢) تایه‌كه‌ی له به‌رد داوه‌و ته‌قاندوێتی

( ٢ ) كۆمه‌ڵی دووه‌م :

(١) گوێی مسی تێ كراوه
(٢) سه‌ری هێناو برد
(٣) دڵی شكاند
(٤) دڵی دایه‌وه
(٥) دڵی شه‌قی برد
(٦) دڵی لێ سه‌ندم
(٧) دڵی لێ هه‌ڵكه‌نراوه
(٨) شه‌ڕی پێ فرۆشتم
(٩) قسه به‌رده‌داته‌وه •

(٣) كۆمه‌ڵی سێیه‌م :

(١) ده‌ستی ڕه‌شه ! ( ئه‌ی بۆ ناوبه‌ناو نایشوات )
(٢) سه‌ری سووكه ! ( خۆ نه‌ت‌كێشاوه تا بزانی )
(٣) سه‌ری گوریسه‌كه‌ی به‌ده‌سته ( هاكا پچڕانی •••• )
(٤) دنیای به‌كۆڵه‌وه گرتووه ( بۆیه ناتوانێ هه‌نگاوێ بروات )
(٥) دڵی له‌سه‌ر له‌پی ده‌ستێتی ( كوا من نه‌م‌دی به‌ده‌ستیه‌وه )
(٦) حه‌مامی ژنانه ! ( ئه‌ی كوا ناتره‌كه‌ی ؟ )

(٤) پلەکانی ئیدیەم(٢٤) :

هەر چەندە یەکێك لە تایبەتی‌یە هەرە گرنگەکانی ئیدیەم لەوەدایە کە واتایەکی تایبەتی بێ‌هاوتا دەبەخشی کە پەیوەندییەکی زۆر دووری بە واتای کەرتەکانیەوە هەیە ، ئاشکرایە کە هەموو ئیدیەمێك لەم‌رووەوە وەك یەکتر نین • هەندێ ئیدیەم واتاکانیان تەواو تاریکەو چەندین پاسای واتاییان دەوێ تاوەکو لە واتای کەرتەکانەوە بمانگەیەننە واتای ئیدیەمەکە هەمووی • هەندێ ئیدیەمی‌تر ، بەپێچەوانەی ئەمانەوە ، گۆرانکاریەکی واتایی کەمتریان بەسەردا هاتووەو تەنیا چەند قۆناغێك لە واتای کەرتەکانەوە دوورکەوتوونەتەوەو بەئاسانتر دەتوانین بیان‌گێرینەوە سەر واتای کەرتەکانیان • بۆنموونە ، ئیدیەمێکی وەك « چنگ لەسەر شان » ناچێتە ریزی ئیدیەمێکی وەك « دڵپاك » یان « سەرراست » ئەگەرچی بە هەمووشیان دەوترێ « ئیدیەم » • واتای « چنگ لەسەرشان » تەواو تاریك‌و لێڵەو زۆر بە گران لە واتای کەرتەکانەوە بەدی‌دەکرێ • بەپێچەوانەشەوە ، هەموو کورد زمانێك هەست بەوە دەکات کە لە « دڵپاك »و « سەرراست »دا ئەو تاریکی‌یەی کە لە ئیدیەمەکەدا هەیە زۆر کەمترەو گەیاندنیان‌و بەستنەوەیان بە واتای پیتی کەرتەکانەوە کارێکی گران نی‌یەو پیویستی بە خەیاڵێکی بەپیت ناکات • سەرنجێکی ورد تێمان دەگەیەنێ کە ئەو جیاوازی‌یە لە « تاریکی »و « روونی » ئەم دوو کۆمەڵە ئیدیەمەدا دەگەرێتەوە بۆ ئەو راستیەی کە لە کۆمەڵی دووەمدا ( « دڵپاك »و « سەرراست » تەنیا یەکێك لە کەرتەکان ــ دڵ‌و سەر ــ واتا بنەرەتیەکەی خۆیان گۆریوەو دوور کەوتوونەتەوەو لەوە کەوتوون کە ئەندامێ بن لە لەشی ئادەمیزاد بەڵکو بوونەتە نوێنەری ئادەمیزادەکە خۆی • کەرتەکانی‌تر ( ــ « پاك‌و راست » ــ ) کەم‌و زۆر واتا بنەرەتیەکەی خۆیان پاراستووە • لەبەرئەوەی ئەم گۆرانکاریەی کە بەسەر ئیدیەمی « دڵپاك » و

« سەرراست »دا هاتووە زۆر بلاوە نەك هەر لە کوردیدا ، بەڵکو لە زمانی‌تریشداو لەبەر ئەوەی بنەمای « بەکارهێنانی پارچە لە جیاتی هەموو » لە ئیدیەمی‌تریشدا دەبینرێ ، کورد زمانێك بە ئاسانی لە کۆی واتای « دڵ »و « پاك »ەوە یان « سەر »و « راست »ەوە زۆر بەئاسانی دەگاتە واتای ئیدیەمەکە هەمووی کە «ئەو کەسەی کە پاکە یان راستە» دەگرێتەوە • بێ‌گومان بەدی‌کردنو دۆزینەوەی واتای « چنگ لەسەرشان » لە واتای کەرتەکانیەوە پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی قووڵترەو زۆربەشمان چەندیش جلەو بۆ خەیاڵ شل کات رەنگە هەر نەی‌گاتێ تا وەکو واتاکەی پێ نەوترێ یان لە فەرهەنگدا دەری‌نەهێنێ یان لەئەنجامی دووپات‌بوونەوەدا بەهۆی دەوروبەری قسەوە بۆی روون‌نەبێتەوە و هەڵی‌نەهێنێ • کەواتە بەلای کەمەوە دەتوانین دوو چەشن ئیدیەم لە یەکتر جیا بکەینەوە :

ئیدیەمی پلە یەكو ئیدیەمی پلە دوو • ئیدیەمی پلە یەك ئەو چەشنە ئیدیەمەیە کە واتاکەی تەواو تاریکەو زۆر لە واتای کەرتەکانی دوورکەوتۆتەوەو پەیوەندیەکی کەی لە رووی واتاوە لەگەڵیاندا ماوەو بۆ گەیشتن لە واتای کەرتەکانیەوە بۆ واتای ئیدیەمەکە هەمووی پێویستمان بە یاسای واتایی ئاڵۆز دەبێت • ئیدیەمی پلە دووش ئەو ئیدیەمەیە کە تارادەیەك واتاکەی روونە یان بەهۆی ئەوەوە کە یەکێك لە کەرتەکانی واتا بنەرەتیەکانی خۆیان پاراستووە یان بەهۆی ئەوەوە کە دەتوانین لە واتای کەرەتەکانەوە بەهۆی یاسایەکی جیهانی‌و بەربڵاوەوە بگەینە واتای ئیدیەمەکە هەمووی • وا لەخوارەوە چەند نموونەیەك لەسەر هەردوو چەشنەکە دەدەین لەگەڵ چەند تێبینیەکدا دەربارەی چۆنیەتی جیاکردنەوەیان لە یەکتری •

(١) ا ــ ئیدیەمی پلە یەك • لە وشەی « دڵ »ەوە :

دڵتەڕ ، دڵقایم ، دڵسووتاو ، دڵشکاو

هەردوو کەرتەکەو واتاکانیان گۆڕاوە :

١ ــ دڵ : نەك هەر كۆئەندامێكی لەشە بەڵكو لەجیاتی ئادەمیزاد بەكارهاتووەو بەواتای « ئەو كەسە كە • • • • • • • »

٢ ــ كەرتی دووەمیش گۆرانی بەسەردا هاتووە • تەڕ « بە واتای بەزەوق » ، قایم = نەترس و سووتاو = بەبەزەیی و شــكاو = پەشــاوە • • • • • • • • هتد •

ب ــ ئیدیەمی پلە دوو : دڵمردوو ، دڵوریــا ، دڵرەق ، دڵنەرم ، دڵپاك ، دڵگەرم • • • • • • •

ئەم ئیدیەمانە واتاكانیان روونترە لە كۆمەڵی ( أ ) لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە : ــ

(١) تەنیا یەكێك لە كەرتەكانیان واتاكانیان تەواو گۆڕاوە • « دڵ » لە هەموو ئەم ئیدیەمانەدا بە واتای « ئەوكەسەی كە •••• » دێ • ئــەم گۆڕانەش هێندە قووڵ نیە چونكە گۆراێكی بلاوە نەك هەر لە كوردیدا بەڵكو لە زمانیتریشداو تەنانەت لە وشەشدا روودەدات وەك بەكارهێنانی « تاج » یان « كۆشك » لەجیاتی « پاشا » كە دەوترێ ، بۆنموونە ، كۆشك بریاریدا ••••• لەجیاتی ئەوەی بڵێین « پاشا بڕیاری •••• » •

(٢) ئەو گۆڕانە كەمەی لە واتای كەرتی دووەمدا هەستی پێ دەكرێ بە گۆڕان دانانرێ چونكە لەراستیدا لە واتای بنەرەتی وشەكاندا هەیە تەنیا لێرەدا ئەم لایەنەی خراوەتە بەر رۆشنایی • بۆنموونە ، دڵمردو لەو واتایەی « مردوو »ەوە وەرگیراوە كە لە رۆنانێكی وەك « زەوق مردوو »دا هەستی پێ دەكرێ • هەروەها « رەق »و « نەرم »و « پاك »و « گەرم »كە لــەو ئیدیەمانەی سەرەوەدا هەن دیسانەوە بە هەمان رێگە لە یەكێك لە واتاكانی ئەم وشانەوە وەرگیراون كە لە رۆنانێكی وەك « مرۆڤێكی پاكە / نەرمە / رەقە »یان پاكە / رەقە / گەرمە / نەرمە لەگەڵ خەڵكیدا » هەســتی پێ

دەکرێ • بە واتایەکی‌تر ، هەرچەندی وشەی « نەرم »و « رەق »و « پاك »
ئەم ئیدیەمانەدا واتاکانیان خوازراوە ، بەڵام « خواستنەکە » ئەوەندە بلاوە
لە زمانداو ئەوەندە بەکارهاتووە کە دەتوانین بە « خوازەی »
دانەنێین‌و لەراستیشدا لە زۆر کەم لەم جۆرە ئیدیەمانەدا هەست بەم
« خواستنە » دەکەین ، هەر لەبەرئەمەشە وا هەست دەکەین کە گێرانەوەی
ئەم ئیدیەمانەو بەستنەوەیان بە واتای پیتەکانیانەوە کارێکی گران نی‌یەو
بەهۆی یاسای واتاییەوە دیاری دەکرێ • هەر ئەمەشە کە وامان لێ دەکات
ئەم چەشنە ئیدیەمانە بە پلە دوو دابنێین چونکە ئەو خواستنەی تیایاندا هەیە
سوواوەو لەکارکەوتووەو جوانی تێدا نەماوەو سەرنجی خەڵکی
راناکێشێ • بەپێچەوانەشەوە ، ئەو خواستنەی لە ئیدیەمی پلە یەکدا هەیە
هێشتا نەسواوەو جوانی تێدا ماوەو کار دەکاتە سەر خەڵکی • جیاکردنەوەی
ئیدیەمی پلە یەك لە ئیدیەمی پلە دوو لەسەر بنەمای واتاییە نەك لەسەر بنەمای
هەڵکەوتی ئەو فۆرمانەی کە ئیدیەمێك پێكدێنن • بە واتایەکی‌تر ، هەمان
فۆرم لەوانەیە لە هەردوو چەشنە ئیدیەمەکەدا خۆی نیشان‌بدات • بۆنموونە ،
وشەی « یەك » لە ئیدیەمی « یەك‌شەوە »لە دروست‌کردنی ئیدیەمێکی پلە
یەکدا بەشداری کردووە چونکە : ــ

١ ــ ئیدیەمەکە فۆرمێکی تێدا نی‌یە بە واتای « ئەوکەسە کە ••••• »
بێت • ( مۆرفیمی [ ــ ە ] لە کوردیدا ناو دروست‌دەکات لە ناوی‌ترەوە
( وەك شەو ← شەوە ، بەڵام نەبینراوە ناوی کار دروست‌کات لەبەرئەوە
ناتوانین بڵێین لێرەدا بەو کارە هەستاوە • )

٢ ــ ئیدیەمەکە فۆرمێکی تێدا نی‌یە کە کەمێك بە لای واتاکەیدا
بچێت و بیری « دەولەمەندی » یان « سامان » بگەیەنێ •

٣ ــ « یەك » لێرەدا ژمارە نی‌یە بەڵکو لەگەڵ « شەو »دا بەیەکەوە
رۆشنایی دەخەنە سەر کورتی ماوەکە •

کەواتە « یەكشەوە » بە واتای ئەوکەسەی کە لە ماوەیەکی کورتدا ساماتێکی زۆری دەستدەکەوێ ، ئیدیەمێکی پلە یەکە چونکە پەیوەندی نێوان واتای ئیدیەمەکەو واتای کەرتەکانی زۆر دوورە لــە یەکتریەوە • دیسانەوە هەمان وشە ، وشەی « یەك » لە دروستکردنی دەیان ئیدیەمی پلە دووشدا بەشداری کردووە وەك « یەك باڵ » ،« یەك تەن » ، « یەك ساڵ »کە تیایاندا کەرتی « یەك » هەر واتا بنەرەتیەکەی خۆی پاراستووە و وەك ژمارە بەکارهاتووەو کەرتەکانیتریش دیسانەوە گۆڕاتێکی هێنــدە بنەرەتییان بە سەردانەهاتووە کە واتای پیتی ئیدیەمەکەو واتا خوازراوەکەی نەگەنەوە بە یەکتری •

هەرچەندە هەموو ئەو نموونانەی سەرەوە لەو ئیدیەمانەن کە «ئاوەڵناون» لە رووی رێزمانەوە ، دەبێ وا تێنەگەین کە ئیدیەمی پلە یەكو دوو تەنیــا لەناو ئەم کۆمەڵە ئیدیەمەدا دەناسرێتەوە • بۆنموونە ئیدیەمێکی وەك « دڵی لە مشتیدایە »یان « دڵی لەسەر لەپی دەستێتی » ئیدیەمی پلە یەکە ، بەڵام « دڵی نەرم بوو »یان « دڵی دەلەرزێت » لەو ئیدیەمانەیەکە پلە دوون*(٢٤) •

( ١٠٥ • پۆلکردنی ئیدیەم :

جیاکردنەوەی فریزو وشەو رستە لە ئیدیەمو دانانی کەرەســەکانی پێشەوە بە دانەی رێزمانیو کەرەسەی دوایی بە دانەیەکی ئاستی واتاسازی ( بروانە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ زانیاری زیاتر ) نــەك هــەر پێویستە بۆئەوەی لە دیاردەی ئیدیەم بگەین ، بەڵکو ئەوەشمان بۆ دەسەلمێنێ کە لە دابەشکردنی ئیدیەمدا دەتوانین دوو رێگە بگرینە بەر :

(١) بەهۆی شیکردنەوەی واتای ئیدیەمەوە وەك پۆلینەکەی د • ئەورەحمانی حاجی مارفو زۆربەی ئەو پولینانەی لە زمانی روسیدا کراون ( بڕوانە پاشکۆی یەکەمی ئەم لێکولینەوەیە بۆ رخاندنێــکی ئەم جۆرە دابەشکردنە بەگشتیو پولینەکەی د• ئەورەحمانی حاجی مارف بەتایبەتی ) •

(٢) بەهۆی شیکردنەوەی ڕۆنانی سـەرەوەی ئیدیەمەکانەوە وەك پۆلینەکەی م • غازی وەیس ( دیسانەوە بروانـە پاشـکۆی یەکەمی ئـەم لێکۆ لینەوەیە بۆ زانیاری زیاتر ) بوونی ئەم دوو ڕێگایە لە دابەشـکردنی ئیدیەمدا ئەو راستیەمان بۆ دەسەلمێنێ کە ئیدیەم دانەیەکی واتایی‌یەو بە هۆی دانەی ریزمانی‌یەوە یان لە شێوەی ئەمانەدا ( لە شێوەی ووشەی لێکدراوو فریزو ڕستەدا )خۆی دەنوێنێ • بە واتایەکی‌تر ، ئیدیەم وەك « واتا »یان « بیر »پەیوەندی بە ئاستی ژێرەوە هەیەو کاتێ کە شێوەی وشەی لێکدراوو فریزو رستە وەردەگرێ ، دێتە ئاستی سەرەوەو بوونێکی فیزیکی دەدرێتێ‌و دەتوانرێ بەپێی ڕۆنان دابەش بکرێت • تا لە شێوەی بیردا بێت‌و لە ئاستی ژێرەوە بێت ، هەر دەتوانین لەسەر بناغەی واتا بیـکەین بە چەنـد پۆل‌و کۆمەلێکەوە • شایانی باسە کە لە هەر دوو پۆلینەکادا تووشی چەنـدین گیروگرفت دێین‌و هیچیان تەواو نموونەیی دەرناچن چونکەئیدیەم ئالۆزترو دژوارترە لە هەموو کەرەسە زمانی‌یەکانی‌ترو[٢٥] زۆر کەم خوی دەدات بە دەست یاسای ڕێزمانی‌و واتاییەوەو لەمەشدا چوتەوە سەر واتاو دانەی واتایی بە گشتی کە لە هەلکەوتدا ناوێزەییەکی ( شواذ ) زۆری تیـدایە[٣٦] •

٢٠٥ پولین بەپێی ڕۆنان •

م بەپێی ڕۆنانی سەرەوە ئیدیەم دەکرێت بە چەند کۆمەلێکەوە :

١ ـ کۆمەلی ناو ـ ئاسا : ئەو ئیدیەمانە دەگرێتـەوە کە ئـەرکی فریزێکی ناوی دەبینن لە ڕستەدا ، بە واتای ئەوەی یان دەبنە بکەر یـان بەرکار • ئەو کۆمەلەش لە چەند کۆمەلێکی بچووکتر پێك دێت :

ا ـ کۆمەلەی ( ناو + و + ناو ) : وەك بڕوبیانو ، بەیت‌و بالورە ، دەست‌و پەیوەند ، ئایین‌و ئۆیین ، باس‌و خواس ، ئاشناو ڕۆشنا ، پشت‌و پەنا ، پەل‌وپۆ ، ڕازو گلەیی ، دێوو درنج •

ب ـ ( ناو + ی + ناو + ( ئاوەلناو ) وەك ، ئەسپێی کراس کۆن •

ج ــ ( ناو + ە + ناو ) وەك : قنگە شەڕ ، پایزە برا ، شەڕە دەنوك ، شەڕەسەگ ، شەڕە شۆق ، فەریکەکەر ، سیرەکۆڵە ، نانەسکی ، برەڤۆك .

د ــ ( ناو + ی + شوێن ) : قسەی گوێ ئاگردان ، بزنی دێلێژە ، پەشتەمالی حەمام .... هتد .

هـ ــ ( ناو + شوین ) وەك شەولەبان ، هەموو ئـەم کۆمەڵانەی سەرەوە لەوەدا یەكدەگرنەوە کە لە دوو کەرتی سەرەکی پێكهاتوون کە هەردووکیان ناون ، جا یان بەهۆی ( و ) یان ( ە ) یان ( ی )ی ئیزافەوە یان بە بێ‌هۆ بەستراون بەیەکترییەوە . دەتوانین دروستبوونی هەموو ئـەم کۆمەڵانە بەهۆی نەخشەیەکی واوە پیشان بدەین .

ن + ناو (          ) = مەرج نی‌یە هەبێ .

و ، ە ، ی = ئامرازی بەستن

= هیچ

أ = یەکێك لە

ن +          أ + ن + ( ئاوەڵناو )

بەمجۆرە دەگەینە یاسایەکی گشتی دەربارەی رۆنانی ئەم جۆرە ئیدیەمە ناو ــ ئاسایانە لە کوردیدا ئەویش ئەوەیە کە لە دوو ناو پێكدێن کە بەهۆی یان بێ هۆ بەسترابن بەیەکتریەوە . لەم ڕووەوە لە فریزی ناوئاسایی دەچن‌و لەمان جیانابنەوە[٢٧] .

چەشنێکی‌تر لـە ئیدیەمی ناو ــ ئاسـا ئەوانەن کە دەتوانین بـە داینامیکی‌یان دابنێین لەبەرئەوەی کەرتی دووەمیان کاریان ڕەگی کارە .

ئەمانەش لە دوو شێوەدا دەبینرێن :

١ ــ ( ناو + کار ) : وەك گورگەزێ ( گورگ ئەزێ )

ئەم کۆمەڵە ژمارەیان زۆر کەمە لە کوردیداو لەوە ناچێت ئیستاکە ئەم

ڕێگەیە بۆ داڕشتنی وشەی نوێ بە کاردێت •

٢ ــ ناو + ڕەگی کار : وەك شەڕفرۆش ، گێرەشێوێن ، کفن‌دز ، کاسەلێس ، نمەك‌ناس •••• هتد •

ئەم کۆمەڵە زۆر چالاکە لە کوردیداو بەردەوام لە داڕشتنی وشەی نوێدا بەکاردێ • شایانی باسە کە ئەم کۆمەڵە دەشتواتن ببنە بەشێك لە ئیدیەمی ئاوەڵناوی چونکە لە کوردیدا هەردوو ئەرکەکە ( ئەرکی ناوو ئەرکی ئاوەڵناو ) دەتوانن ببینن لە ڕستەدا وەك بەم‌نموونانەی خوارەوەدا بۆمان دەردەکەوێ •

١ ــ گێرەشێوێن بۆ دەرەوە • ( منالەکان بۆ دەرەوە ••• )[٢٨] •

٢ ــ ئیدیەمی ئاوەڵکار ئاسا :

بەو ئیدیەمانە دەوترێ کە دەتوانن لە ڕستەدا ئەرکی ئاوەڵکار ببینن ، بە واتای ئەوەی چۆنیەتی کارەکە دیاری بکەن • ئەم چەشنە ئیدیەمە لە جۆرەکانی‌تر زۆر کەمترن لە ژمارەداو لە چەند شێوەیەکی دیاری کراودا دەبینرێن :

١ ــ ( ناو + و + ناو ) : وەك « تەپ‌ونم » = « ڕەپ‌وڕاست » ، « کوت‌و پڕ » لە ڕستەی ( ڕەپ‌وڕاست قسەکەم نایە مستی ) یان ( کوت‌وپڕ خۆی کرد بە ژوورەکەمدا ) •

٣ ــ ( ناو + شوین ) : « چنگ لەسەرشان » لە رستەی « چنگ لەسەر شان هەلی‌کوتایە سەرمان » •

ئەم جۆرە ئیدیەمەش دەتوانین لە شێوەی یاسایەکدا پێشان بدەین چونکە یان لە دوو ناو یان ئاوەڵناو پێك‌هاتوون کەبەهۆی ئامرازێکەوە (و) یان بەهۆی ئامرازێکی پەیوەستەوە ( حرف جر ) بەسترابن بەیەکتریەوە :

ناو (ئاوەڵناو) + أ و [یان ئامرازی پەیوەست] أ + ناو (ئاوەڵناو)[٢٩] •

٣ ــ ئیدیەمی ئاوەڵناو ــ ئاسا :

ئەو ئیدیەمانەن کە ئەرکی ئاوەڵناو دەبینن بە واتایەکی‌تر لە رستەدا جێگەی ئاوەڵناو دەگرنەوە بە شێوەیەکی گشتی ، دەتوانین ئەم چەشنەش بکەین بە دوو کۆمەڵەوە کە هەریەکەیان لە چەند کۆمەڵێکی وردتر پێك‌هاتوون :

ا ــ ئیدیەمی ئاوەڵناوی نادینامیکی : ــ بەو ئیدیەمە ئاوەڵناو ئاسایانە دەوترێ کە کار یان رەگی بەشداری لە دروست‌بوونیاندا ناکات •

ئەم چەشنە لە چەند کۆمەڵێکی بچووکتر پێك‌هاتووە :

١ ــ کۆمەڵی ( ناو + ناو ) : وەك : خەیاڵ‌پلاو •

٢ ــ کۆمەڵی ( ئاوەڵناو + و + ئاوەڵناو ) : وەك : رەق‌وتەق ، کش‌ومات ، شل‌وشیواو ، عال‌وسال ، کاڵ‌وکرچ •

٣ ــ ( ناو + ئاوەڵناو ) : وەك : ترزك ، دەست‌رەش ، دەست‌پیس ، دەست‌پاك ، ڕووخۆش ، دڵخۆش ، گوێ‌لەق ، چاوچنۆك ، زمان درێژ ، زمان‌لووس ، لووت‌بەرز ، سك‌پڕ ، چاونەرم ، ڕووڕەش ، سەرسەخت ، ڕەزاگران ، لەش‌سووك •

٤ ــ (ناو + ئاوەڵناوێکی لێکدراو) : وەك : لێو بەبار ، مانگا بەکەڵ ، چاو بەخومار ، لەش بەبار ، لەش بەدووشاو •

٥ ــ ژمارە ( ئاوەڵناو ) + ناو وەك : دووزمان ، دووگیان ، تەنیاباڵ ، یەك‌قسە •

٦ ــ ( ناو + شوێن ) وەك : چــاو لەدەر ، چاو بەرەوژێر ، ئاگری بنکا ، گونکی سەر دڵ ، گوێلەمست •

ب ــ ئیدیەمی ئاوەڵناوی داینامیکی : بەو ئیدیەمە ئاوەڵناو ئاسایانە دەوترێ کە کەرتی دواوەیان یان کارە یان لە کارەوە وەرگیراوە • ئــەم چەشنەش لە چەند شێوەیەکدا دەبیندرێ وەك :

١ ــ ناو + ••••• + پارتی سپڵ : وەك : قنگ لێکەوتوو •

٢ ــ ئاوەڵناو + ڕەگی کار : وەك : دوورکــوژ ( = لــەدوورەوە جوانە ) ، ڕەشبین ، دوورناس ، دووربــین ( = پێش بینی لــە دوارۆژ دەکات ) گەشبین •••• هتد[٣٠] •

٤ ــ ئیدیەمی کار ــ ئاسا •

بەو ئیدیەمانە دەوترێ کە یەکێك لە کەرتەکانی ، بەتایبــەتی کەرتی دواوە لە شێوەی کاردا بێت • ئەم جۆرە ئیدیەمە زۆر لە سادەترین رستەی کوردی ( کار + ڕاناو ) نزیك دەبێتەوە چونکە زۆربەیان تەنیا ڕاناوێکیان کەمترە لەم جۆرە رستەیەو دانانی ڕاناوەکەش پێویستە بۆ تێگەیشتن لە ئیدیەمەکە هەر چەندە بەشێکی سەرەکیش نیيە لێی • ئیدیەمی کار ــ ئاسا لە زۆر شێوەدا دەبینرێ لە کوردیدا • وا لەخوارەوە هەندێ لەم شێوانە دەخەینەڕوو : ــ

١ ــ ( ناو + کار ) وەك : بــاری کەوت ••••• ئابڕووی چــوو ، پێستیان گووروو ، ئاشی دەگەرێ •

٢ ــ ( ناو + ئاوەڵناو + کار ) : ئاگرەکــەی خۆش کــرد ، دەمی شیرین کرد ، دەمی چەور کرد •

٣ ــ ( ئاوەڵکار + کار ) : بەرز دەفڕێ ، زۆری تێدەگووشی •

٤ ــ ( ناو + و + ناو + کار ) : پەڕوباڵی دەرکرد •

٥ ــ ( ناو + کار + ئاوەڵکار ) وەك : ئاوی کردە ژێر •

٦ ــ ناو + ( بەرکاری ناراستەوخۆ ) + کار : ئاگری تێ بەربوو ، ئاش بەتاڵی ( پێ ) کرد ، پێی ( لێ ) داگرت ، دانی پێدا نا •

خ ــ ( ڕونانی جەر + کار ) : بە دەمیدا دا ، بەر گوێم کەوت ، بەسەرا چووم ، بە شووی دا ، لەسەری کردەوە ، بەسەرمان دەکاتەوە ••• هتد شایانی تێبینی‌یە کە هەندێ لەم شێوانە زۆر بڵاو نین لە زمانەکەداو تەنیا چەند نموونەیەکمان لەسەریان دەست دەکەوێ ( وەك ٥ ) • هەندێ شێوەی‌تریان ، بەپێچەوانەوە ، زۆر بڵاون‌و بەردەوام ئیدیەمی نوێمان دەدەنێ وەك ( ١ ، ٦ ، ٧ ••• ) لەبەرئەوەی ئیدیەمی کار ــ ئاسا لە کوردیدا شێوەی زۆرە ، نەمانتوانی هەموو شێوەکانی کۆبکەینەوەو دابەش بکەین‌و ئەو شیوانەی سەرەوە هەموو باسەکە تەواو ناکەن‌و هەندێ شێوە هەیە نەمانخستۆتە بەرچاو تا باسەکە هێندەی‌تر ئاڵۆز نەکەین • بۆ نموونە ، لەو دابەشکردنەوەی سەرەوەدا جێگەمان بۆ ئەو ئیدیەمە کارئاسایانە دانەناوە کە کارەکەیان ( هەبوون / بوون ) ن •

وەك : دڵیان بەیەکترەوەیە / سەری گوریسەکەی بەدەستە / بوو بەڕیشەوە / بوو بە پەڕۆ / •••• هتد*(٣٠) •

لێرەدا پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشین کە هەندێ ئیدیەم ( وەك هەندێ ووشە ) لە زیاتر لە کۆمەڵێك لەمانەی سەرەوەدا دەبینرێن • بە واتایەکی‌تر ، هەندێ ئیدیەم لە کۆمەڵێکەوە دەچن بۆ کۆمەڵێکی‌ترو بەپێچەوانەوە وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

(١) پرسەگورگانێی پێ ناوێ • ( ناو ــ ئاسا )

پرسه گور گانیِ‌ی پێ کردین ( کار ــ ئاسا )

(۲) باری کەوتووە ( کار ــ ئاسا )
بار کەوتووەکان ( ناوی بکەر )
بار کەوتوو ( ئاوەڵناو )

(۳) جێی خۆی خۆش‌کرد ( کار ــ ئاسا )
حەزم لە جێی خۆ خۆش‌کردن نی‌یە ( ناو )

(٤) خۆی بردە پێشەوە • ( کار ــ ئاسا )
حەزی لە خۆبردنە پێشەوەیە ــ ( ناو ــ ئاسا )

ب ــ پولین بەپێی واتا :

لە پۆلینکردنی واتاییدا دوو بۆچونی جیاواز بەدی‌دەکرێ •

١ ــ پۆلین بەپێی بابەت

ئەو زمانەوانو شارەزایانەی کە ئیدیەم بە کێشـەیەکی زمانـەوانی کارەکی دادەنێن خۆیان بـە کۆکردنەوەی ئیدیەمو لێکدانەوەی واتـاو شیکردنەوەیان خەریك دەکەن بێ‌ئـەوەی گوێ‌بدەنە کێشـە تیوریـیـە سەرەکیێکانی ئیدیەمو چۆنیەتی دابەشکردنیان •هەندێکیش لەمانە لـــە فەرهەنگەکانیاندا ڕێگەی بابەتیان گرتووە لە پۆلێنکردنی ئیدیەمداو ئیدیەمی کشتوکاڵیان لە ئیدیەمی ڕاوو یاریو ماڵەوەو مووبـەقو خوێنـدەواری جیاکردۆتەوە(٣٢)* •

ئەم بۆچوونە زیـاتر لای ڕۆژئاواییـەکان ( ئەوروپـای ڕۆژئاواو ئەمریکاییەکان ) باوێتیو بو ئەوکەسانەیە کە دەیانەوێ فێری زمانێـکی بێگانە بن • ئەمەش لەبەرئەوەیە کە فیربوونی ئیدیەمو زاڵبوون بەسەریدا یەکێکە لەو گیروگرفتە سەختانەی کە دێنە ڕێگای خوێنـدکاری زمـانی

بێگانەو زاڵ بوون بە سەریدا پیویستی بە هەوڵێکی یەکجار زۆرە •

٢ ــ پۆلین بە پێی پەیوەندی نێوان سەرجەمی واتای ئیدیەم ، واتای کەرتەکانی :

ئەم بۆچوونە زیاتر گوێ دەدات بە لایەنە تیوورییەکانی ئیدیەمو خۆی بە شیکردنەوەی واتای کەرتەکانیەوە خەریك دەکاتو دەیەوێ پەیوەندی نێوان واتای سەرجەمی ئیدیەمو واتای کەرتەکانی دیـاری بکات • ئـەم کێشەیە زیاتر لە لایەن زمانەوانەکانی یەکێتی سۆڤیەتەوە گوێی دراوەتیو تارادەیەك تەنیا لای ئەمـان ( فریزیولوجی ) بۆتـە بەشـێکی گرنـگی زمانەوانی*[٣٣] •

یەکێك لەو پۆلینە واتاییانەی کە لەم ڕووەوە لە ئیدیەم دەکۆڵێتـەوە دابەشکردنە بەناوبانگەکەی ڤینۆگرادۆڤە کە لە بنەڕەتدا بۆلێکۆڵینەوەی ئیدیەم لـە ڕووسـیدا دایناوە*[٣٤] • ئـەم پۆلێنـە کـە بریتی‌یە لـە دەستکاری‌یەکی بنەڕەتی پۆلینەکەی زمانەوانی سویسری چارلز بالی*[٣٥] ، بەندە بە تاریکی‌و ڕوونی ئیدیەمەوەو*[٣٦] بەپێی ئەم بنەمایە ڤینوگرادۆڤ سێ جۆر ئیدیەم ( یان فریزیولوجی ) جیادەکاتەوە :ــ

١ ــ ئیدیەمی ( فریزیولوجی ) تێکچرژاو Phrasiologioal Fusions

بەو ئیدیەمانە دەڵێ کە کەرتەکانیان تەواو تێك ئاڵاونو واتای کەرتەکان بەتەواوی لەناو بۆتەی ئیدیەمەکەدا تواونەتەوەو واتای ئیدیەمەکە لە واتـای کەرەتەکانەوە پێش‌بینی ناکرێ • ئەم‌جۆرە ئیدیەمە بە ئاسانی لە زمانێکەوە وەرناگێڕرێتە سەر زمانێکی‌تر • نموونە لە کوردیدا : کێ بە کێ‌یە ؟ چنگ لەسەرشان ، سەرچاو ( هاتی ) •••• هتد •

٢ ــ ئیدیەمی یەکگرتوو :

بە باوەری ڤینوگرادۆڤ ئەم جۆرە ڕوونە ، بە واتای ئـەوەی کـە

واتاکانیان تاڕادەیەك لە کەرتەکانەوە بەدیدەکرێن • جگە لەمەش لە ژمارەدا لە جۆری یەکەم زۆرترن‌و واتای کەرتەکانیشی خوازراوە • ئەمانە زیاتر خۆ دەدەن بە دەست یاسای گۆڕانکارییەوەو بەئاسانیش وەردەگێڕرینە سەر زمانی‌تر*(٣٧) •

٣ ـ ئیدیەمی لێکدراو

ئەم چەشنە ئیدیەمە تەواو ڕوونەو یەکێك لە کەرتەکانی ڕاستەوخۆ واتای خۆی داوە بە ئیدیەمەکەو واتای کەرەتەکەی‌تریش خوازراوە • ئەم جۆرە ئیدیەمە زیاتر لە جۆری دووەمیش خۆی دەدات بە دەست یاسای گۆرانکارییەوە وەك : قسەومسە ، شت‌ومت ، زمان‌لووس ، دڵرەق •••• هتد لە زمانی کوردی‌دا •

سەرنجێکی ورد لەو دابەشکردنەی سەرەوە ئەو راستیەمان بۆ دەردەخات کە لەگەڵ ئەوەشدا پۆلێنەکە لەسەر بناغەکی درووستە چەند کەم‌و کورتیەکی تێدایە تەنیا لەو کاتانەدا دەردەکەوێ کە دەمانەوێ لە زمانی‌تردا بەکاری‌بێنین ؛ کەم‌و کورتیەکانیش ئەمانەن : ـ

١ ـ تاریکی‌و ڕوونی کەرەسە لەرووی واتاوە نابێت بە بنەمایەکی تەواو بۆ پۆلین کردنی دیاردەیەك چونکە تاریکی‌و ڕوونی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی‌تر دەگۆڕێ بە پێی پلەی رۆشنبیری‌و شارەزایی لە زماندا •

٢ ـ ڤینۆگرادۆڤ زۆر سەرکەوتوو نی‌یە لە جیاکردنەوەی جۆری یەکەم‌و دووەمی ئیدیەمدا چونکە ئەو بنەمایانەی دەماندا‌تێ لە هەردووکیاندا هەیەو دەبێ تەنیا بە رادە یان پلەی بونیاندا دوو جۆرە ئیدیەمەکە لە یەکتر جیابکەینەوەو ئەمەش لە خۆیدا کارێکی ئاسان نی‌یە • بۆنموونە ، کە هەوڵی ئەوە دەدەین پۆلێنەکەی لە کوردیدا بەکاربێنین دەبینین دەیان ئیدیەم سەر بە هەردوو بەشەکە دەردەچن‌و پۆلێنەکە دەستەوسان

دەوەستێ بەرامبەریان چونکە بە پێی ئەو بنەمایانەی کە هەمانــە ( وەك تاریکیو ڕوونی ، توانینی وەرگێرانو خوازراوییو نەخوازراویی ... هتد ) لە یەکتر جیا ناکرێنەوە . بۆنموونە ، هەرچەندە ئیدیەمی « دڵپیس » و « دڵپـاك » لــە یــەك چەشــنن بەپێی تاریکیو ڕوونیو خوازراوییو نەخوازراوی ، ئەگەر بەپێی توانســتی وەرگێڕانیان بێت ئــەوا دەبێت هەریەکەیان سەر بە جۆرێك بن ، « دڵپاك » سەر بە ئیدیەمی یەکگرتووە چونکە بەئاسانی وەردەگێڕرێتە سەر زمانیتر وەك عــەرەبیو ئنــگلیزی و « دڵپیس » سەر بە جۆری تێکچرژاوە چونکە بەئاسانی وەرناگێڕرێتە سەر زمانیتر . لێرەدا دەبێ ئاگەداری ئەوە بین کە تەنانەت ئیدیەمی ( دڵپاك ) یش بە دلنیاییەوە نادرێت تەنیا بە یەکێك لــە چەشــنەکان چونــکە دەتوانین بیشیسەلمێنین کە دیسانەوە دەگەرێتەوە بۆ جۆری سێیەمیش لەبەرئەوەی یەکێك لە کەرتەکانی « پاك » تارادەیەکی زۆر واتای خۆی پاراستووە و لە « پاکی جلەوە » بۆ « پاکی دەست » و « پاکی دڵ » بازێکی واتایی گەورە نەدراوەو دەتوانرێ بەئاسانی هــەر دوو واتاکە بــگەیێنرێتە یــەکتری . بەمجۆرە دەبینین پۆلێنەکەی ڤینوگرادۆڤ وەك زوربەی پۆلێنە واتاییەکان درشتەو ناتوانێ بە وردی ئەوچەشنە ئیدیەمانەی ناویاندەنێ لە یەکتریــان جیابکاتەوە .

هەروەك لە سەرووترەوە دەرمان خست پۆلینەکەی ڤینوگرادوڤ لەم شێوەی ئێســتایدا زۆر بەگران لــە کوردیدا کەڵکی لێ وەردەگیرێت . بەلام گۆڕینێکی زۆر کەم لە پولێنەکەدا وایلێدەکات بەکەڵکی کوردی بێت . گۆڕینەکەش ئەوەیە کە دەست لە جیاکردنەوەی جۆری یەکەمو دوەم هەڵگرینو هەردووکیان بشکێنینەوەو وبیانکەین بــە یەك جۆر چونکە هەروەك لە سەرووترەوە پیشانمانداد جیاکردنەوەی ئەم دوو جۆرە لەسەر ئەو بنەمایانەی کە ڤینوگرادوڤ داوێتی کارێکی زۆر گرانەو هەندێ ئیدیەم سەر بە هەردوو جۆرەکە دەبنو جیاناکرێنەوە . بەدوای گۆڕینێکیوادا ، تەنیــا

دوو جۆر ئیدیەم لە کوردیدا لە رووی واتاوە لـە یەکتری جیادەبنـەوە : ئیدیەمی یەکگرتوو و ئیدیەمی لێکدراو • لە ئیدیەمی یەکگرتوودا واتـای ئیدیەمەکە لەئەنجامی تواندنەوەی واتای کەرتـەکانەود دێو لەژێر کاری مێژوویی خەڵك و کەلچەرەکەیاندایە • لە رواڵەتدا ئەم جۆرە ئیدیەمانە رِەقو وشكو نەگۆڕن بە واتای ئەوەی کەرتەکانیان شوێن ناگۆڕنو رێگە بـە کەرەسەیتر نادەن لە یەکتری بیانترازێنێو بێتە نێوانیانەوەو خۆشـیان پاشو پێش کەم دەکەن • هەندێ جار ئەم وشـکیو نەگۆڕییە بـەهۆی ( وەزنو قافیە )و لێكچوونی دەنگو هاوواتایی یان دژواتاییەوە چەسپاوتر بووە ( بۆنموونە ، حازروبزر ، هاتەرانو پاتەران ، بێسێودوو ، دیقوفیق ( تەنك ) ، ریسو گوریس ، حوشترو قاپقاپ ••• هتد ) هەندێ جاریش رِەقیو نەگۆریی ئیدیەمەکە دەگەرێتەوە بۆئەوەی یەکێك لە کەرتەکانی کۆنەو لەناوچووەو بەکارنایـەت ( وەك « نۆلـە » لـە ئیـدیەمی « نۆنۆلـە »و « لۆغان » لە ئیدیەمی « شاییو لۆغان »دا ••• هتد) • زوربەی کاتو واتای ئەم جۆرە ئیدیەمانە جوانترو رِەوانبێژترو بەهێزترە لە واتای ئەو کەرەسانەی کە لە زمانەکەدا هەن بە هەمان واتای ئەمانـەو دەتوانرێن لـە جێگەیـان بەکاربێن وەك لەم نموونانەی خوارەوە دەردەکەوێ :

(١) « چنگ لەسەرشان خۆی کرد بەژووردا » = بەپەلە ••••• یان بـە خێرایی خۆی کرد بەژووردا •

(٢) «دڵیان بە یەکترییەوەیە » = یەکتریان خۆشدەوێ یان حەزیان لـە یەکتر کردووە •

(٣) «دڵی لە ژنەکەی پیسە » = گومانی لە ژنەکەیەتی •

(٤) « رِوو گەرمە » = « ناسکە لە گەڵ خەڵکدا » •

(٥) دەستێکی گەیاندە مناڵەکە = لە مناڵەکەی دا •

ئیدیەمی لێکدراو ، بەپێچەوانەی جۆری یەکەمەوە ، تەنیا یەکێك لە کەرتەکانی گۆڕانی واتایی بەسەردا دێ‌و ئەم گۆڕانەش مەرج نی‌یە هێزو ڕەوانبێژی‌و جوانی پێ ببەخشێت • جگە لەمەش لە رووناندا شل‌و شیواوترە، بە واتای ئەوەی ڕێگا زۆرتر دەدات بە یاسا گۆڕانکارییەکانی زمان‌و ئاساییش خاوەنی ئەو هۆیانە نی‌یە کە کەرتەکانی ئیدیەم توونه دەکاتەوە وەك وەزن‌و قافیەو دژواتایی‌و هاوواتایی •••• هتد • بەم‌پێ‌یە ، هەموو ئەم ئیدیەمانەی خوارەوە لە جۆری لێکدراون :ـ

١ ـ گۆشتی خۆشە ( = برینی زوو چاك‌دەبێتەوە ) گۆشتی تاڵە ( = گۆشتی درەنگ چاك‌دەبێتەوە ) ، گۆشتی قیمەت ناکات ، لە یەکەم و دووەمدا « گۆشت » واتای خۆی پاراستووە ، « تاڵەو » « خۆشە » کەمێك واتایان گۆڕیوە • لە سێ‌یەمدا « گۆشت » واتاکەی گۆڕاوەو بووە بە ( = « کەس یان خۆ » ) •

٢ ـ گوێی مسی تێ‌کراوە ( تێ‌ناگات ) یان « کەرە » گوێی تەپە ( = سەرشۆڕە ) ؛ گوێی لێ خەفاندووە • ( خۆی لێ کەڕ کردووە ) لە یەکەمدا « گوێ » بە واتا بنەرەتیەکەی خۆی هاتووەو « مس تێ‌کردن » بە واتای « گرتن » و « داخستن » هاتووە وئەمەش کەمێك گۆڕانی واتایی تێدایە • لە دووەم‌و سێ‌یەمدا « گوێ » بە واتای نوێ بەکارهاتووە • شایانی سەرنجە کە پولینەکەی ڤینوگرادوڤ لەدوای ئەم گۆڕینەی ئێمە پێشنیازی دەکەین لەگەڵ جیاکردنەوەی ئیدیەمی پلە یەك‌و پلە دوودا ( بڕوانە بەش چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە ) یەك‌دەگرێتەوەو وەك یەك دەردەچێ • بە واتایەکی‌تر ، هەموو ئەو ئیدیەمانەی ئێمە بە پلە یەکیان دادەنێین دەچنە جۆری یەکگرتوو ( یان تێکچرژاوەوە ) و هەموو ئیدیەمە پلە دووەکانیش لەو جۆرە دەبن کە ڤینوگرادوڤ لە پۆلینەکەی خۆیدا بە « لێکدراو »یان دەداتە قەڵەم •

٦ ــ گەشەی واتایی لە ئیدیەمدا :

بۆئەوەی لەو گەشە واتایی‌یە بگەین کە بەسەر فریزێکی بەرەڵا یان وشەیەکی لێکدراودا دێت‌و دەیکات بە ئیدیەم پێویستە دوو جــۆر واتــا لەیەکتری جیابکەینەوە(٣٨) :

١ ــ واتای سەرەکی ( یان راستەوخۆ یان گشتی ) •

٢ ــ واتای لاوەکی ( یان خوازراو یان تایبەتی ) •

جۆری یەکەم ئەو واتایە دەگرێتەوە کە وشەیەك یان کەرەســەیەکی زمانی‌تر کاتێك پەیدای دەکات کە خۆی بەتەنیا بەکارهاتبێت ( وەك ئــەو واتایانەی کە فەرهەنگ توماری دەکات ) یان لەگەڵ هاوسێ‌و هــاورێ‌ی ئاسایی خویدا بێت وەك واتای وشەی « باران » لەم ڕستانەی خوارەوەدا :

(١) ئێمە نەگەیشتبوینەماڵەوە کە باران لێ‌ی داکردین •

(٢) بارانەکە هەموو گیانمانی تەڕکرد •

(٣) لە ماوەیەکی کورتدا بارانەکە لافاوێکی دروست‌کرد • وەك ئەم ڕستانەی سەرەوە بۆمان دەردەخەن واتای سەرەکی « وشەی باران » بریتی‌یە لە چەند سیمایەك کە بە هۆیانەوە دەتوانین « باران » لە دیاردە نزیکەکانی ( وەك تەرزە ، بەفر ، ســەهۆل ••••• هتــد ) جیابکەینــەوە • ســیما جیاکەرەوەکانی بارانیش وەك واتای فەرهەنگی وشەکە بۆمان دەردەخات لەمانەی خوارەوە پێك‌هاتووە :

١ ــ باران بریتی‌یە لە دڵۆپە ئاو •

٢ ــ ئەم دڵۆپانە خەست بوونەتەوە •

٣ ــ ئەم دڵۆپانە ڕەق نەبوون ( نەیان‌بەستووە ) •

٤ ــ ئەم دڵۆپانە لە هەورەوە دێن بۆ سەر زەوی •

٥ ــ ئەم دڵۆپانە گەلێ جار زۆرو تیژو بەهێزنو خێرا بەدوای یەکتریدا دێن • هەندێ لەم سیمایانە ناو کۆیە ( هاوبەشە ) لەنێوان « باران » و « تەرزە »و « بەفر »دا وەك سیمای ( ١ ، ٢ ) • هەندێکیتریان « باران » لە « تەرزە » جیادەکاتەوە ( سیمای ٣ ) • سیمای پێنجەمیش ناوکۆیە لەنێوان « باران »و « تەرزە » ، بەڵام ئەم دووانە لە « بەفر » جیا دەکاتەوە • واتای سەرەکی وشەی « باران » بریتی‌یە لە کۆی هەموو ئەم سیمایانە بە یەکەوە •

جۆری دووەم ، واتای لاوەکی ، ئــەو واتایەیــە کــە وشــە یــان کەرەسەیەکی‌تری زمان لەئەنجامی کۆبوونــەوەو هەڵس‌وکەوت‌و ڕەفتاری لەگەڵ هاوڕێی نائاساییدا پەیدای دەکات • بە واتایەکی‌تر ، ئــەم جۆرە واتایە ، تەواو بەندە بەدەوروبەرەوە و وشەکە بەهۆی ئەم‌لاو لایەوە ئــەم واتایە دێنێتە کایەوە • واتای لاوەکی لەوانەیە هەر یەکێك بێت لە ســیما جیاکەرەکانی واتای ســەرەکی‌و درابێتە بەر ڕۆشــنایی‌و پێی لەســەر داگیرابێ • بۆنموونە ، وشەی « باران » لەئەنجامی کۆبوونەوەیدا لەگەڵ چەند کەرەسەیەکدا کە زۆر کەم « هاوڕێیەتی » دەکەن ، دەتوانێ واز لە هەموو سیماکانی خۆی بێنێ‌و یەکێك لە ســیما لاوەکیــەکان هەڵبژێرێ‌و پی‌داتە بەر ڕۆشنایی وەك لەم ڕستەیەی خوارەوەدا دەبینین :

گوللە وەك باران دەبارێ •

لێرەدا بەهۆی دەوروبەریەوە ــ لەئەنجامی کۆبوونــەوەیدا لــەگەڵ وشەی « گوللە »دا ــ « باران » دەستی لە سیمای ١ ــ ٤ هەڵگرتووەو تەنیا سیمای پێنجەمی داوەتە بەر ڕۆشنایی ، لەکاتێکدا کە ئەم سیمایە تەنانەت یەکێکیش نی‌یە لەوانەی کە « هەمیشەیی » بێت ، بەواتایەکی‌تر ، هەموو بارانێك زۆرو تیژو بەهێز نی‌یە ، دڵۆپەکانی مــەرج نی‌یــە خێرا بەدوای یەکتریدا بێن لەبەرئەوەی ســیمای پێنجەم ، هەروەك لەسەرەوە دەرمــان خستووە هاوبەشــە لەنێوان « باران » و « تەرزە »دا ، وشەی « تەرزە »

دەتوانێ لە هەمان رستەدا جێگەی « باران » بگرێتەوە :

گوللە وەك تەرزە دەبارێ •

بەلام لەبەر هەمان هۆ وشەیەکی وەك « بەفر » ناتوانی بەم کارە هەڵسێ لەبەرئەوە رستەیەکی وەك گوللە وەك بەفر دەبارێ ناپەسەندە •

بەمجۆرە دەبینین لەو ڕستانەی سەرەوەدا « باران » واتایەکی لاوەکی یان تایبەتی وەرگرتوە چونکە بەهۆی دەوروبەریەوە ( بەهۆی هاورێی نائاساییەوە ) هەندێ لە سێما جیاکەرەوە بنەڕەتیەکانی خۆی سڕیوەتەوە و سیمایەکی لاوەکی هێناوەتە پێشەوەو داویەتە بەر ڕووناکی • هەر وەك چۆن لە شانۆگەرێتیدا هەموو ڕۆشنایەکە هەندێ جار دەخرێتە سەر خاڵێکی بچووكو هەموو ئەملاولای خاڵەکە لە تاریکیدا دەهێلرێتەوە ، لێرەشدابەهۆی دەوروبەری وشەکەوە دەتوانین یەکێك لە سیما ناسەرەکیەکانی وشەی باران ، کە توندو تیژیو زۆریو خێراییە ، بەمجۆرە، بۆ ماوەیەکی کورت ، هەموو سیماکانیترمان شاردۆتەوە یان سڕیوەتەوە ، هەرچەندە سیماکان ماون ولە بەکارهینانیتری وشەکەدا دەردەکەونەوە ، لەم بەکارهێنانەدا « تەجمید » یان لەکارخراون • ئەم نموونانەی کە لەسەرەوە داومانە دەربارەی گۆڕانی واتایە لە وشەدا ، بەلام سەرنجێکی ورد ئەو راستیەمان بۆ دەردەخات کە ئیدیەم دروستبوونیش لەئەنجامی هەمان گۆڕانی واتاییەوە ( سیما سڕینەوەو سیما بەررۆشناییدان ) دەبێ ؛ بۆنموونە واتای سەرەکی ووشەی « پەردە » وەك لەم رستانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ •

١ ــ پەردەکە دادەرەوە با دیار نەبین •

٢ ــ پەردەکە دڕاوە •

٣ ــ ئەو پەردەیە هەڵدەرەوە با چاومان لە کۆلان بێ •

بە واتای ئەو پارچە قوماشەیە کە بەسەر دەرگا ، پەنجەرە یان کونیکدا دەدرێ بە مەبەستی داپۆشین یان شاردنەوەو خاوەنی سێ سیمای واتاییە کە لە دیاردە نزیکەکانی خۆی جیادەکاتەوە • سیماکانیش شتێکن لەمانەی خوارەوەدا : ـ

١ ـ بەسەر « کونێکدا » دەدرێ •

٢ ـ لە پارچە قوماشێك پێكدێ ( لێرەدا قوماش دەبێ گونیەو شتیتریش بگرێتەوە ) •

٣ ـ بۆ شاردنەوە بەکاردێ •

هەمان وشە کە لەگەڵ وشەی « کوللە »دا کۆدەبێتەوەو وشەی لێکدراوی « پەردەو کوللە » دروستدەکەن وەك لە ڕستەی لە پەردەو کوللەدا دەنووین لە ترسی مێشوولە واز لە یەکێك لە سیما جیاکەرەوەکانی خۆیدێنێ ـ ( سیمای یەکەم )و دووانەکەیتر دێنێتە پێشەوەو دەیانداتە بەر ڕووناکیو بەمجۆرە لە پێناسەی « پەردەو کوللە »دا گرنگی دەدرێ بەوەی کە لە پارچە قوماشێکی تەنك پێكدێتو بۆ خۆپاراستنە •

سێمای یەکەم کە پەردە دەبێ « بەسەر کونێکدا بدرێ » لەکارخراوەو گۆڕاوە بۆ بە « دەوری قەرەوێلەدا دەدرێ » • لەبەرئەوەی ئەم گۆڕانە شتێکی هێندە سەرەکیو دوور لە یەکتری نین ـ هەردووکیان هەر شوێن دەگرنەوە ـ « کوللەو پەردە » بە ئیدیەم ناژمێررێن چونکە هێشتا واتاکەی لەواتای کەرتەکانیەوە پێشبینی دەکرێ •

دیسانەوە هەمان وشە ، وشەی « پەردە » کە لەگەڵ کاری « پیادە »دا کۆدەبێتەوەو بەتایبەتی کە کارەکە شێوەی « فەرمان » وەردەگرێ لە ئیدیەمی :

(١) هەر پەردەیەکی پیا ( د )ە ( پێدادە ) •.

ئەوا نەك تەنیا وازی لە سیمای یەکەمی هێناوە ( لێرەدا دەرگاو پەنجەرە زیاتر سەرمان لێ تێکدەداو نایەڵێ بۆ واتای ئیدیەمەکە بچین ) بەڵکو سیمای دووەمیشی ( پارچە قوماش ) دەست پێوەناوەو دووریخستۆتەوە • لەم ئیدیەمەدا تەنیا سیمای سێیەم ( شاردنەوە ) هاتۆتە پێشەوەو دراوەتە بەر ڕۆشنایی ( بێ گومان سیماکانیتریش هەر ماون هەرچەندە چوونەتە تاریکیەوەو بوون بە ژێر لێوەوە وکەم دەزدەکەون • لێرەوە « کون » بووە بە « کەمو کورتیەك » یان « عەیبێك » کە پێویستی بە « شاردنەوە » هەیەو پەردەکەش ، ئەو شتەی کە عەیبەکەی پێ دادەپۆشرێ مەرج نیە قوماش بێ بەڵکو هەموو شتێ دەگرێتەوە ••• ) لەبەر ئەمەشە کە بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکەی پێویستمان بە ووشەیوا دەبێ کە بە واتای « شاردنەوە » بێت لە شێوەی فەرماندا وەك :

(١) هەر بیشارەوە •

(٢) هەر باسی مەکە ( ئەوەندە ناپەسەندە ) •

(٣) هەر لای کەس ئەم قسەیە مەکە :

(٤) هەر مەهێڵە کەس بزانێ •

وەك بەم ڕستە هاوتایانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوی ، « پەردە » وازی لە دوو سیمای بنەرەتی خۆی هێناوە لە ئیدیەمەکەدا لەبەرئەوە لێکدانەوەی وشەی وەك « قوماش » و « کونی » هەر تێناکەوێ • بەڵکو لەجیاتی « پەردە » دەتوانین بۆ لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی واتای ئیدیەمەکە وشەیەکی وەك « قوڕ » بەکاربهێنین کە تەنیا لە واتادا لەوەدا لەگەڵ « پەردە »دا یەكدەگرنەوە کە هەردوکیان بۆ مەبەستی «شاردنەوە»و « داپۆشین » لێرەدا بەکاردێن ، ( هەرچەندە داپۆشین مەبەستێکی سەرەکی

« قورِ » بەکارهێنان نی‌یە ، بە واتای ئەوەی « قورِ » وەك « پەردە » هەر بۆ « شاردنەوە » بەکارنایەت ) • ئەم رستەیەی خوارەوە ئـەم راسـتی‌یە دەسەلمێنێ • هەر پەردەیەکی پیادا دە = هەر قورِێکی پیادا دە •

لەبەرئەوەی گۆرِانی واتایی هەر لەخۆیەوەو بێ رێ‌وشوین رِوونادات ( ئەگەر وابوایە کەس لە واتای نوێی وشە نەدەگەیشت ) ، بەڵکو بەپێی یاسایەکی مـەنتیقی‌و دەروونی دەرِوات بـەرِێوە ، دەتـوانین جۆرەکانی واتاگۆرِین دیاری‌بکەین‌و بزانین کام لەم گۆرِانانە بەسەر وشەیەکی لێکدراو یان فریزێکدا هاتووەو گۆریوێتی بۆ ئیدیەم*[٣٩] • واتـا گۆرِین چەنـد جورێکی هەیە کە گرنگترینیان ( ئەوانەی لـە دروسـت‌بوونی ئیدیـەمی کوردیدا دەوری باڵایان هەیە ) ئەمانەی خوارەوەن •

(١) واتا خواستن •

واتا خواستن بەندە بە لێکچوونی دووشت یان زیاتر لە رووی ئەرك ، دیمەن ، رەفتار یان شوێن‌و کاتەوە • ئاسایی دوو جۆر خواستن لە یەکتری جیادەکرێتەوە :

ا ــ خوازە :

لێرەدا دووشت ( یان زیاتر ) بەیەکتری ئەچویندرێن‌و ناوی یەکێکیان دەنرێ لەوی‌تر ( یان لەوانی‌تر ) • خوازە لە هەڵکەوتدا زۆر لە لێکچوواندنێ دەچێ کە ئامرازی لێکچوواندنەکەی نەمابێت ( لێکچوواندنی شاراوە )[٤٠] لێکچوواندن لە خوازەدا لەوانەیە لە رووی ئەرکەوە بێت ، ( وەك « سەر کار » وەك چۆن « سـەر » لەشی ئادەمیزاد « دەبات‌بەرِێوە » هەروەهـا سەرکاریش ئەرکی « سەر » دەبینێ یان کار دەبات‌بەرێوە ) یان لەرِووی دیمەنەوە ( وەك سیەمارە ــ سیە وەك مـار ) ، یـان لـەرِووی شـوێنەوە ( وەك : سـەرقاپ ، قاچی مێز ) ؛ زۆر جاریش لێکچوواندنی نیوان دوو

شت پەیوەندی بەکاتەوە هەیە ( وەك کورتە چیروك ، چیرۆکی درێژ یـان وتارێکی کورت ) • بلاوترین جۆر لە خوازە لـە زمانی کوردیدا ، ئەوانەن کە پەیوەندیان بە ئەندامی لەشی ئادەمیزادەوە هەیە ( وەك : دەمی کانی رووبار ، چاوی مێز ) دەستی ( دەستکی ) کورسی ، زمانو ملو لەشی پاندان •••• هتد ) واتای خوازەی زمانی بەئاسانی لەدەورو بەرەوە هەلدێو جۆری لێکچووندانەکە بەئاسانی جیادەکرێتەوە بێئەوەی پیویستیمان بـە بیرێکی قولو لێکدانەوەیەکی زۆر بێ وەك ئەوەی لـە خوازەی ئەدەبیـدا پێویست دەبێ*(٤١) • نموونەمان زۆرە لەسەر ئەو ئیدیەمانەی کە بەهۆی خوازەوە لە کوردیدا دروستبوون • وا لەخوارەوە هەندێ نموونە دەخەینە روو تەنیا بە مەبەستی روون کردنەوەی رێبازەکە نەك بەنیازی تومار کردنی هەموو ئەو ئیدیەمانەی بەمرێگەیە دێنە زمانەکەوە چونکە ئەمانە لە ژمارەدا بێسنوورنو وهەر روو لە زۆر بوونیشن •

هەزار قورو چلپاو بە قنگیا هەلپرژاوە = ( قال بووە ) ؛ وشکەپیاو ؛ وەك ترێ بن گۆم رۆیشت ؛ وەك ئاو بخواتەوە ، ( بە ئاسـانی ) ؛ ناوی بەقوردا ( بە کۆلەکەی ، قورگی ئاشدا ) بچێتە خوارێ ، نانی کەوتـە رۆنەوە ؛ مێشی میوان نییە = ( بێ باکـە ، گوێ ناداتە هیچ ) ، ریشـی ماشو برنجە ( رەشو سپی تێـکەلە ) ، مـەچۆرە ژێر داری شـکستە ؛ مارانگازە ؛ لێی کەوتە تەقە = لێی کەوتە پلار هاویشتن ؛ لەنێو دوو ئاگردایە ؛ مل لە چەقۆ ئەسوێت ، لە گوێی گادا نووستووە ، ئاوی کردە ژێر ، لـە بنی کولەکەکەی دا = هەموو نهێنییەکانی درکاند • ماسـتاو دەکات = دەیەوێ خۆی بەرێتە پێش ، لە یەك پرن ، نانی شوانی خواردووە •

لێکچوواندنەکە لە هەندێ لەمانەدا لە رووی دیمەنەوەیە ( وەك ریش ماشو برنج ، لە هەندێکی تریاندا لەرووی ئەرکەوەیە ( ماستاو دەکات = چۆن ماستاو رێبوارێکی تینوو رازی دەکات ، رەفتاری تۆش هەمان ئەرك

دەبینێ بـۆ ڕازی کردن ) لـە بەشێکیانیشدا لێکچوونەکە پەیوەندی بـە ڕەفتارەوە هەیە ( وەك مێشی میوان نی‌یە = وەك چۆن گوێ ناداتە مێشێ بەلایدا بڕوا ، کێشەکانی ژیانیشی هەروا بەئاسانی گرتووە ) • دیسان لـە هەندێکی‌تریاندا لێکچوونەکە لە ڕووی شوێنەوەیە ( وەك ، لە گوێ‌ی گادا نووستووە = گوێ‌ی گا وەك ئەو دنیایەی تۆ داخراوەو هەوالی بۆ ناچێ ؛ هەروا : لە بنی کولەکەکەی دا = کولەکە = شوێنی هەموو نهێنیەکانە کە شکا هەموو نهێنی‌یەکان دێنە دەرەوەو دەکەونەڕوو ) •

لە بەشێکی زۆریش‌دا واتا گواستنەوەکە لەوەدایە کە وشە سەرەکێکە واتاکەی فراوانتر بووە ، بە واتای ئەوەی شت زیاتر دەگرێتەوەو زۆرتـر دیاردە دادەپۆشێ*[٤٢] • ئەم واتا فراوانی‌یەش بێ‌گومان لەئەنجامی ئەوەدا دێت کە وشەکە لەگەڵ هاورێ‌ی‌تردا خۆی دەبینێتـەوەو دەوروبـەری « نائاسایی » بۆ خۆی دروستکردووە • بێ‌گومان زوربەی کات وشەکە بە هەردوو واتاکە ، واتا فراوانو واتا تەسکەکەیەوە ، لە زمانەکەدا دەمێنێتەوە ، هەرچەندە هەندێ جار لەدوای بڵاوبوونەوەی وشەکە بە واتا فراوانەکەی ، واتا تەسکەکەی لەناودەچێو لە زمانەکەدا نامێنێ • شایانی تێبینی‌یە کە ئەم واتا فراوانە زۆربەی کات وشەکە لە بەشێکی ناوەوە( ناوی بەرجەستە ) دەباتە بەشێکی تر ( ناوی نابەرجەستە ) • وا لەخوارەوە هەندێ ئیدیەمی کوردی دەخەینە روو کە واتاکانیان لەوەوە دروستبوون کە وشە سەرەکێکە ( نان ) واتایەکی فراوانتری بۆ خۆی پەیدا کردووە : ـــ

(١) نانو دۆی بڕی ( دەری پەڕاند ) •

(٢) نانی بڕی ( = لە کارەکەی دەریانکرد ) •

(٣) نانو نمەك دەتگرێت ( = چاکەی دەتگرێت ) •

(٤) نانو نمەکیان بەیەکەوە خواردووە ( = هەقیان بەسەریەکەوە هەیە ) •

(٥) نانی بە ئاو نابێت ( = نابێت بە هیچ ) •

(٦) نانی کەوتۆتە رۆنەوە ( = کەوتۆتە خۆشیەوە ) •

(٧) نانی نانی‌یە ( = چاکە بۆ چاکە دەکات ) •

(٨) نانی وا لە دۆلەی ئەودا ( = بەهۆی ئەوەوە دەژی ) •

(٩) نانی پێ پەیدا ناکرێ ( = خۆی پێ بەخێو ناکرێ ) •

(١٠) نانێکی بەو رۆنەوە خواردووە ( = جارێك خێری لە شتی بینیوەو بەتەمای کەڵکی تریشە لێی دەستکەوێ ) •

لە هەموو ئەم ئیدیەمانەی سەرەوەدا وشەی « نان » واتاکەی فراوان کردووە بە واتای « هەر شتێك کە مرۆڤ پێی‌دەژی ، [ بژوێن ] دێت » • لە هەمان‌کاتیشدا وشەکە واتا تەسکەکەی خۆی پاراستووە و ( وەك چووە نان بکرێ ؛ نانێکی بیست فلسی بێنە ، نان‌وچا دەخۆی ) هەردوکیان شان‌بەشانی یەکتری لە زمانەکەدا ماونەتەوەو بەکاردێن •

ب ــ درکە(٤٣) •

لەم جۆرە خواستنەدا ئەو دوو شتەی ناو دەگۆرنەوە زۆر نزیکن لە یەکتری ، بە واتایەکی‌تر ، لێرەدا ناو گۆرینەوەکە لەنێوان دوو شتدا دەبێ کە لە واقیعدا پەیوەندیان زۆرە لەگەڵ یەکتریدا • لەوانەیە پەیوەندی‌یەکە پەیوەندی شوێن بێت یان کات ، ئەرك بێت یان هۆ یان لەوانەشە یەکێك لە شتەکان نیشانەی ئەویتریان بێت • بێ‌گومان ، ئەم جۆرە واتا خواستنە ، وەك خوازە ، تەنیا هەرلە ئیدیەمدا دەورێکی باڵای نی‌یە بەڵکو لە بواری تریشدا زۆر بەکاردێ وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ •

(١) شارەکە خرۆشا ( لێرەدا مەبەست لە خەڵکی شارەکەیە ) •

(٢) گەرەکەکە لێمان کوبۆوە •

(٣) وەستاین تا ماڵەکە هاتنەدەرێ •

(٤) ئەو قۆرییە / کترییە بڕێژە • ( چایەکەی یان ئاوەکەی ناوی •• ) •
کاری ئەم جۆرە واتا خواستنە لە ئیدیەمدا زۆر بلاوە • وا لەخوارەوە چەند نموونەیەك دەدەین‌و دوو شتە پێوەندی‌دارەکەش دیاری‌دەکەین •

(١) ورگی ســەرناوە = قەڵەو بووە ( پێوەندی‌یەکە لەنێــوان ورگ‌و خواردندایە ؛ ورگ سەرنان لە ئەنجامی زۆرخۆری‌یەوەیەو دەبێتــە هۆی « قەڵەوی » ) •

(٢) لێوی لێ نەداوە = نەی خواردووە ، تامی نەکردووە • ( پێوەندی‌یەکە لەنێوان لێوو کو ئەندامــانی خواردندایــە لەبــەر ئــەوە « دەم » دەتوانێ جێگەی بگرێتەوە • )

(٣) لێوی لە لێوی نەداوە = قسەی لەگەڵ نەکردووە •

(٤) لێوی هەڵنەپچڕی = قسەی نەکرد •

( لە هەر دووکیاندا « لێــو » پێوەندی لەگەڵ ئەندامــانی ئاخافتن‌دا هەیە لەبەرئەوە « زمان » دەتوانێ بێتە جێگەی بە هەمان واتا • )

(٥) دووکەڵ لە ماڵی هەڵناسێ = هەژارە •

( دووکەڵ لێرەدا نیشانەیە بۆ « چێشت لێنان » ؛ دووکەڵ ( جاران ) لەهەر ماڵێکەوە هەڵسابێت ، ئەوا نیشانەی ئەوەبووە کە ماڵەکە شتێ ئامادە دەکەن بۆ خواردن ) •

دەبێت لێرەدا پەنجە بۆ ئەو ڕاستیە رابکێشین کە واتا خواستن بــە هەموو جۆرەکانیەوە دیاردەیەکی زۆر بلاوە نەك هەر لە زماندا بەڵکو لــە ئەدەبیشدا هەرچەندە دیاردەکە لە زمان‌و ئەدەبدا لە یەکتری جیاوازن(٤٤) •
لە واتا خواستنی ئەدەبیدا نووسەرو خوێنەر هەردووکیان کەم‌و زۆر بەئاگان

له خواستنه‌كه ٠ جگه له‌مه‌ش واتا خواستن له ئه‌ده‌بدا به‌ری بیركردنه‌وه‌و خه‌یالی ره‌سه‌نی تاكه شاعیرێك یان نووسه‌رێكه ٠ هه‌رچی واتا خواستنی زمانی‌یه ، قسه‌كه‌رو گوێگر یان نووسه‌رو خوێنه‌ر مه‌رج نی‌یه هه‌ست به بوونی بكه‌ن ٠ له سه‌رێكی‌تریشه‌وه ، دیارده‌كه له زماندا مۆری كۆمه‌لی پێوه‌یه‌و مانه‌وه‌و له‌ناوچوونی به‌نده به بڕیاری كۆمه‌له‌وه ٠

جگه له واتا خواستن ، واتا گۆڕین شێوه‌ی‌تریش وه‌رده‌گرێ ٠ هه‌رچه‌نده ئه‌مانه ده‌وریان له ئیدیه‌م دروست كردندا كه‌متره له رێگه‌ی پێشو ، به‌لام ئه‌وه‌نده گرنگن كه نه‌توانین به‌ئاسانی بیان‌خه‌ینه پشت گوێ ٠ وا له‌خواره‌وه زۆر به‌كورتی له‌م رێگه‌یانه‌ش ده‌دوێین ٠

١ ــ خوێ پێوه كردن ( موبالغه )[٤٥] ٠

هه‌ندێ جار واتای ئیدیه‌مه‌كه به‌گشتی بریتی‌یه له‌و خوێ‌یه‌ی كه پێی خۆش‌كراوه ٠ به واتایه‌كی‌تر ، هه‌ر ئه‌وه‌نده كه زانیمان ئیدیه‌مه كه خوێی پێوه كراوه ئیتر به‌شی زۆری واتا شاراوه‌كه‌یمان دۆزیوه‌ته‌وه‌و ده‌توانین پێش بینی واتا گشتی‌یه‌كه‌ی بكه‌ین ٠ بۆنموونه ، له ئیدیه‌می « موو به‌به‌ینیانا ناچێ » ، هه‌ر كه زانیمان لێره‌دا « موو » بۆ موبالغه به‌كارهاتووه ، ئیتر ده‌زانین كه ئیدیه‌مه‌كه به واتای « زۆر نزیكن » یان « زۆر رێكن له‌گه‌ل یه‌كتریدا » دێ ٠ نموونه‌ی‌تر ، ده‌رباره‌ی ئه‌م دیارده‌یه له كوردیدا زۆره وه‌ك « هه‌ژده هه‌ژده قسه ده‌كات = ( زۆر ٠٠٠٠٠ ) ، هه‌زار ئالم‌و ساتم ده‌كات ؛ هه‌زار ته‌له‌ی به كلك ته‌قاندوه = ( زۆر فێلبازه ) ؛ هه‌زار په‌لی به پشتی براكه‌ی‌دا داوه ، هه‌ر ده‌ره لنگێی له مالی پاوه ؛ له هه‌موو دیزه‌یه‌كدا ئه‌سكۆی‌یه ؛ له هه‌ولێر كۆنتره ( = زۆر كۆنه ٠٠٠٠ ) ؛ له سه‌گ سوال ده‌كات ( = زۆر هه‌ژاره ) ؛ له هه‌زار ئاوی داوه ( = زۆر وریایه ) ؛ هه‌زار فاكت به فیكێكی ( = زۆر فێلبازه ) ؛ یه‌ك باله = ( بێ یاریده‌ده‌ره ) ؛ یه‌ك قسه‌یه ( = له قسه‌ی خۆی په‌شیمان نابێته‌وه ) ، هه‌ر داتێكی به سه‌د سال

دەرخاتووە ( = زۆر پیسکەیە ) ؛ هەر پەلێکی بە دەست ئیزرائیلیێکەوە بێت = ( چەندیش پشتی هەبێ ) ؛ لە هەزار ئاشی کرد ( = زۆر هەوڵی دا ) ••••• یەکێك لە تایبەتیەکانی ئەم جۆرە ئیدیەمانە ئەوەیە کە لە لێکدانەوەیاندا پێویستمان بە وشەیەکی وەك « زۆر » یان « چەند » یان « هێندە » دەبێ •

٢ ــ تەوس[٤٦] :

هەندێ جار بۆ لێکدانەوەی ئیدیەمێك پێویستمان بەوە دەبێت کە بزانین بەتەوسەوە گوتراوە ، بە واتایەکی‌تر ، واتای ئیدیەمەکە کتومت پێچەوانەی واتای وشەکانە • بۆنموونە ، کە دەڵێین « پاشەڵی جوانە » ؟ واتای ئیدیەمەکەمان بۆ لێك‌نادرێتەوە تا لەو ڕاستیە نەگەین کە لێرەدا « جوان » بەتەوسەوە بۆ گاڵتە پێ‌کردن بەکارهاتووەو کتومت پێچەوانەی « جوان »ەو زیاتر بە واتای « پیس » یان « بۆگەن »دێ هەمان گۆرانی واتایی لە ئیدیەمی « دەست‌بخەرە دەمیەوە بزانە دەیگەزێت »و « دەستی بە ماڵی خۆیەوە نا »و « دەستی خێری نایە سەر » وە دەیان ئیدیەمی‌تردا بەدی‌دەکرێ •

٣ ــ پۆشین[٤٧] :

دروست‌بوونی هەندێ ئیدیەم لە بنەرەتدا بۆ داپۆشینی چەند دیاردەیەکە کە لەبەر چەند هۆیەکی کۆمەڵایەتی یان دینی دەمانەوێ بە زەقی‌و ڕاستەوخۆ لێیان نەدوێین‌و بەلایاندا نەچین • ئەم دیاردانە بەزۆری پەیوەندییان لەگەڵ جنس‌و نەخۆشیدا هەیە نموونە لەسەر ئەو جۆرە ئیدیەمانەی کە بۆ پۆشین هاتوونەتە کایەوە زۆرە وا لە خوارەوە هەندێکیان دەخەینەڕوو : ــ

(١) دەستیان لێ وەشاندووە ( = لە بریتی « شێت بووە » ) •

(٢) دەستیان تێکەڵ کردووە •

(٣) دەست بە ئاو دەگەیەنێ •

(٤) چاو لەدەرە •

(٥) چووە سەر جێگای •

(٦) لە دەردەکەیەتی •

(٧) بازاری گەرمە ( بۆکچ ) •

(٨) دڵیان بە یەکترەوەیە •

(٩) دڵ تەڕە •

(١٠) دوو گیانە ( بۆ ژن = سکی پڕە ) •

شایانی تێبینییە کە هەر ئیدیەمێ وەرگرین دەبینین کە بەزیاتر لە یەکێك لەم گۆڕانە واتاییانەی سەرەوەدا تێپەڕ بووە • بە واتایەکی تـر هەمیشـە دووان یان زیاتر لەم گۆرانە واتاییانە لە ئیدیەمێکدا هەنو هەست بەبوونیان دەکرێ • بۆنموونە ، کە دەڵێین « لە حەوت ئاشی داوەو مشتێ ئـاردی نییە » ، ئەوا ژمارەکە ، « حەوت » بومان دەردەخات کە قسەکە خوێی پێوە کراوە ، لە هەمانکاتیشدا « مشتێ ئارد » خوازەیـە ، بـە واتـای « بژوێن » دێ ( هەر شتێ مرۆڤ پێی بژی ) •

دیسانەوە دەتوانین وشەی « ئارد » وەك « درکە »ش سەیر بکەین چونکە لەجیاتی « نان » بەکارهاتووە کە یەکێکە لەو کەرەسە گرنگانەی کە لە ئارد دروستدەکرێ • هەروەها دەبینین کە بە واتای ئەو « ئـاردە » نەهاتووە کە دەکرێتە کیسەو فەردەوەو لە بازاڕ دەفرۆشرێ ، بەڵکو بـە واتای بژوێن هاتووە • بەمجۆرە دەبینین لە ئیدیەمێکی وادا نزیکەی هەموو جۆرە واتا گۆڕینەکان ( خوازەو درکەو موبالەغە ) •• هەموو بەیەکەوە

دەورێکی باڵایان گێڕاوە لە دەرهێنان‌و دروست‌کردنیدا •

٧ ـ کورتەی لێکۆڵینەوەکە :

لەم لێکۆلینەوەیەدا زاراوەی ئیدیەم ئەورۆنانە دەگرێتەوە کە لە دوو ووشە یان زیاتر پێك‌هاتبێت‌و لێکدانەوەیەکی سیماتێکی هەمیشەیی هەبێت‌و واتای گشتی لە واتای کەرتەکانیەوە دیاری نەکرێ • ئیدیەم دانەیـەکی سیمانتیکی‌یە ، ( دیاری‌کردنی سنوری بەندە بە واتاوە ) بەڵام لـە فریزو رستەو وشەی لێکدراودا خۆی دەنوێنێ • لەبەرئەمە ، بە گرنگمان زانی لەسەرێکەوە ئیدیەم لەمانە جیابکەینەوەو لە سەرێکی‌تریشەوە ، لە پۆلین کردنی ئیدیەمدا فۆرم‌و واتا بکەینە بنەما • یەکێك لـە مەبەستە هـەرە سەرەکێکانی ئەم لێکوڵینەوەیە ، ئەو مەبەستەی کە لە چەندین شـوێنی ئەم لێکۆلینەوەیەدا دووپات‌کراوەتەوە ، ئەو راستی‌یەیە کە ئیدیەمی ئیمڕۆی زمانی کوردی ( و تەنانەت هەموو زمانێکی تریش ) لە بنەرەتدا نموونەی بەکارهێنانی خوازەی زمانی بوون‌و بە تێپەڕبوونی کات یەکێك لەم واتـا خوازراوانە جێگیر بووەو خۆی سەپاندووەو ڕەق هەڵگەڕاوە[٤٨] • کورد زمانێکی ئیمڕۆ لەوانەیە تەواو بێ‌ئاگا بێت لە واتای بنەرەتی ئیدیەمێك ؛ لەوانەشە بەئاگا بێت • بەئاگایی‌و بێ‌ئاگاییەکەی پەیوەندی تەواوی بـە کۆنی‌و نوێیی ئیدیەمەکەوە هەیە ، ئەو ئیدیەمانەی کاتیان زۆر بەسەردا تێپەڕیوە ، واتـا پیتیەکەیـان ( واتـا بنـەرەتیەکەیـان ) لـەناوچووە ؛ بەپێچەوانەشەوە ، ئەو ئیدیەمانەی کە تارادەیەك نوێن ، هەر دوو واتاکەیان زیندووەو شان‌بەشانی یەکتری بەکاردێن هەرچەنـدە واتـا خوازراوەکە ( ئیدیەمەکە ) بڵاوترە •

بە ڕای لێکۆلەر ئەو یاسا واتاگۆڕانەی کە فریزێك یان ووشەیەکی لێکدراو دەگەیەنە پلەی ئیدیەم هەر ئەو یاسا گشتیانەن کە لە واتا گۆرین‌دا دەورێکی باڵا دەبینن وەك خوازەو درکەو پۆشین‌و موبالەغەو کردن بە ژێر

**لێوەوەو واتا فراوان کردنو ٠٠٠٠٠ هتد ٠**

هەرچەندە لێکۆڵەوە لێرەدا لە هەڵکەوتو چۆنیەتی نووسینەوەی ئەم یاسایانە نەدواوە ، ئاشکرایە کە ئەو رایانەی کە لە دوابەشی لێکۆلینەوەکەدا دەری بڕیون بۆ ئەوە دەستدەدەن کە بکرێنە بنەما بۆ دەرهێنانی ( بەو واتایەی کـە تەحویلی یەکان بەکاری دێنن ) ئیدیەم لـە فریزو وشـەی لێکدراوی ئاسایی یەوە[٤٩] ٠ بێ گومان یەکێك لە تایبەتی یەکانی ئەم جۆرە یاسایانە دەبێ سـیما گۆڕین بێ و ( سـیمای واتایی فریزە بنەرەتی یەکە بگۆری بەوەی سیمای تری بداتێ یان هەندێ لە سیما بنەرەتیەکان بسڕێتەوە ) ٠ یاساکانیش دەبێ بەسەر رۆنانی سەرەوەی « فریزێکدا » جێ بەجێ بکرین ٠

## پاشکۆی لێکۆلینەوە[١]

کاری پێشتر دەربارەی ئیدیـەم لـە کوردیـدا ، پیـداچوونەوەو نرخاندنیان : ئیدیەم لەو دیاردە زمانیانەیە کە لەچاو دیاردەکانی تری زمانی کوردیدا کەمێك گوێی پێدراوەو چەند کتێبێك و لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی نوسراوە ، بەلام بەشی زۆری ئەم کارانە لـە هەڵکەوتدا لـە فەرهـەنگ نزیكدەبنەوەو لە کاری ڕێزمانیەوە دوورن*[٥٠] ٠ بە واتایەکی تر ، زۆربەی ئەم کارانە بریتین لـە گەڕان بەدوای ئیدیەمی کوردیداو تومارکردنیـانو لێکدانەوەو شیکردنەوەی واتاکانیان ٠ بێ گومان نووسەری ئەم کارانـە ئاسایی گرنگی نادەن بە لایەنی تیوری کێشەی ئیدیەمو بەدەگمەن خۆیان بە کێشەی پۆلین کردنیانەوە خەریك دەکەن ٠ هەر لەبەرئەمەشە کە زۆربەی جار ئیدیەمەکان لەم کارانەدا بەپێی تیپی سەرەتای ئیدمەکە ریز دەکرێنو باسیان لێوە دەکرێت ٠ بێ گومان ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم جۆرە کارانە ئاسـانن یـان بێ کەڵکن ، بەڵکو بەپێچەوانەوە لـەم کارانەدا ئەرکێکی

زۆر گەورە دەکەوێتە سەر شانی نووسەرو بەرهەمەکەش کارەکی‌یەو دەبێتە بناغەیەك بۆ لێکوڵینەوەی تیووری •

لەناو ئەو کارانەدا کە پێشتر دەربارەی ئیدیەم نووسراون ، دوو لێکۆلینەوە جێگەی تایبەتی‌یان هەیەو شایانی توژینەوەیەکی وردن ، چونکە ئەم دووانە بۆ یەکەم جار لە کوردیدا خۆیان لە هەندێ لایەنی تیوری ئیدیەم دەدەن‌و هەوڵی‌دەدەن زانیارییانە ئیدیەمی کوردی دابەش بکەن • ئەم دوو لێکولینەوەیەش ، یەکەمیان چەند باسێکی :

د• ئەورەحمانی حاجی مارفە*[٥١]و دووەمیان لێکۆڵینەوەیەکی کورتی م• غازی فاتح وەیسە[٥٢] •

د• ئەورەحمانی حاجی مارف لە پێشەکی لیکۆڵینەوەکانیدا فریزی گیراو ( کە لێرەدا ئیدیەمی پێ دەڵێین ) لە فریزی نەگیراو ( ئاسایی ) جیادەکاتەوەو پێناسەیەکی « ئیدیەم » دەکات کە زیاتر بەنــدە بــە واتــاوە • بــەدوای ئەمانەشدا ، د • پۆلێنێکی واتایی ئیدیەم دەخاتە ڕوو کە لە بناغەو زاراوەدا لە پۆلێنەکانی ڤینوگرادۆڤ‌و لارین‌و سمبرتتسکی دەچی*[٥٣] • هەرچەندە لە وردەکاریدا ( تفاصیل ) لەمانەوە دوورە • لەم بوارەدا د • ئەورەحمـــان هەندێ ڕاستی بۆ یەکەم جار دەربارەی کوردی دەخاتەڕووو چەند تی‌بینیەکی ورد دەربارەی دیاردەکە بەگشتی تۆمار دەکات • کورتی کارەکەی د • بــە بیرو ڕای ئێمە لە دوو خاڵدا کۆدەبێتەوە : ــ

١ ــ لە لێکولینەوەکەیدا د• ئەورەحمان گرنگی‌یەکی تەواوی داوە بە « واتا »و کەم‌و زۆر خۆی بە فۆرمی ئیدیەمەوە خەریك‌نەکردووەو هەوڵی ئەوەی نەداوە ئیدیەم لەو وشەی لێکدراوو ڕستەو لاڕســتە جیابکاتەوە یان بە پێی ئەرکیان دابەشیان بکات • لە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆلینەوەیەدا لەو ڕاستی‌یە دواوین کە ئیدیەم هەرچەندە دانەیەکی واتاییە دەبێ لە رووی

فۆرم‌و واتاوه لێی بكولرێته‌وه چونكه ئیدیه‌م خۆی له شێوه‌ی وشه‌ی لێكدراوو فریزو رسته‌دا ده‌بینێته‌وه •

۲ ـ پۆلینه واتاییه‌كه‌ی د• ئه‌ورەحمان تاراده‌یه‌ك درشته‌و دیارده‌كه به‌ته‌واوی ڕەچاو ناكات‌و جۆره‌كانی ئیدیه‌م به‌ته‌واوی‌و بێ‌گیروگرفت له‌ یه‌كتری جیاناكاته‌وه •

جگه له‌وه‌ی كه پۆلێنه‌كه پشت به دوو بنه‌مای جیاواز ده‌به‌ستێ ، فریزولۆژی یه‌كگرتوو به پێی واتا له‌وانی‌تر جیاده‌كاته‌وه ، گوایا واتاكانیان له سه‌رپاكی پارچه‌كانه‌وه هاتووه ، به‌ڵام فریزیولۆژی تێك‌ئالاوو تێكچرژاو به‌هۆی چالاكی ـ مرده‌و زیندویی ـ كه‌رته‌كانیانه‌وه جیاده‌كاته‌وه )*[٥٤] • د• ئه‌ورەحمان نه‌یتوانیوه سه‌ركه‌وتوانه جۆری دووم‌و سێیه‌م له‌ یه‌كتری جیا بكاته‌وه به‌جۆرێك كه ئیدیه‌می یه‌كگرتوو تێكه‌ڵ به‌ ئیدیه‌می تێك‌ئالاو نه‌بێ‌و هه‌ریه‌كه‌یان سنووری خۆیان بپارێزن • بۆنموونه ، ئیدیه‌می « خۆله‌ته‌ل‌دان » به جۆری تێك‌ئالاو داده‌نێ چونكه « له‌ته‌ل‌دان » ته‌نیا له‌م فریزه‌دا هه‌یه‌و له كوردیدا به‌م واتایه جارێكی‌تر به‌كارنه‌هاتووه • هه‌روه‌ها ئیدیه‌می « ناوی به گه‌رووی ئاشا چێ » به جۆری یه‌كگرتوو داده‌نێ[٥٥] له‌به‌رئه‌وه‌ی « واتاكه‌ی » له سه‌رپاكی ئه‌و وشانه‌وه كه پێكیان‌هێناوه ده‌رده‌كه‌وێ • ئاشكرایه ئیدیه‌مه‌كه‌ی دوایی به ئاسانی ده‌توانرێ له هه‌مان كاتدا به‌جۆری تێك‌ئالاو دابنرێ ، چونكه « گه‌رووی ئاش » جارێكی‌تر به‌م واتایه‌ی كه لێره‌دا هه‌یه‌تی هه‌رگیز دووباره نابێته‌وه • دیسانه‌وه هه‌موو ته‌م ئیدیه‌مانه « ده‌سته‌ئه‌ژنۆ » ، «كای كۆن به‌باكردن» «كه‌وڵه كۆن» به‌پێی پولینه‌كه‌ی د• سه‌ر به هه‌ردوو جۆره‌كه ده‌بن چونكه واتای ئیدیه‌مه‌كه له‌ سه‌رپاكی واتای كه‌رته‌كانه‌وه هاتووه‌و له هه‌مان كاتیشدا ئه‌و كه‌رتانه‌ی ئیدیه‌مه‌كه پێك‌دێنن وه‌ك ده‌سته = ده‌ست له سه‌ر ، كه‌وڵ*[٥٦] = پیاو ، كا = به واتای « شه‌ڕو ناخۆشی » ، هه‌رگیز جارێكی‌تر به‌م واتایانه

بەکار نەهاتوونەتەوە • وەنەبێ پۆلێنەکە هەر لە نموونەکانی د• خۆیدا تووشی گیروگرفتمان بکات ، بەڵکو هەمان نەگونجان دێتە ڕێگەمان کە دەمانەوێ پۆلینەکە بۆ جیاکردنەوەی ئیدیەمی‌تر بەکاربهێنین • دەتوانین ، بۆنموونە ، زۆر بەئاسانی بی‌سەلمێنین کە دیسانەوە ئیدیەمێکی وەك « ئاگرێکی نایەوە » ( نموونەکەی م• غازی ) لە هەمانکاتدا ( بەپێی ئەو بنەمایانـەی کە د• ئەوڕەحمان داویێتی ) سەر بە هەردوو جۆرەکە دەبێ • لە لایەکەوە لە جۆری یەکگرتووە چونکە واتاکەی لەسەر پاکی کەرتەکانیەوە دێ : بە واتایەکی‌تر کاتێ « ئاگر » بە واتای « ئاشووبە » و « شەڕ » دێ کە لەگەڵ کارێکی وەك « نانەوە » و « خۆشکردندا » کۆبوویێتەوە •

لە لایەکی تریشەوە ئیدیەمەکە لە جۆری تێك‌ئالاوە چونکە یەکێك لە کەرەسەکان « نایەوە » جارێکی‌تر لە کوردیدا بە واتـای « کردنـەوە »و خۆش‌کردنی « ئاگر » ، تەنیا لە چەند مەودایەکی زۆر تەسکداو بەتایبەتی هەر لەگەڵ کاری « نانەوە »و « خۆشکردن »دا بە واتای فیتنەو شـەڕو ئاشووب دووبارە دەبێتەوە •

هەرچەندە ئەم دوو کەم‌وکورتی‌یە لە نرخی کارەکەی د• ئەورەحمان کەم‌دەکاتەوە ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لێکولینەوەکانی دەربارەی ئیدیەم وردن‌و کەلێنێکی باشیان گرتووە •

شایانی تێبینییە کە ئێمە لەم لێکولینەوەیەدا هەوڵی ئەوەمـان داوە لەم دوو کورتی‌یە خۆ لادەین ، لەبەر ئەوە لە بەشی یەکەم‌و دووەم‌و سێ‌یەمدا لە ڕووی فۆرمەوە لە ئیدیەم دەکۆڵینەوە •

بەشەکانی تریشمان بە گشتی بۆ ئیدیەم لە ڕووی واتـاوە تەرخـان کردووە • دیسانەوە بۆ ئەوەی نەکەوینە هەڵەی دابەشکردنەوە ، دوو جۆر پۆلین کردنمان خستۆتەڕوو : بەپێی ڕۆنان‌و بەپێی واتا ( بڕوانە بەشی

« ە » ) • لە پۆلێنی واتاییشـدا هـەوڵی ئەوەمـان داوە ( بە پێچەوانەی پۆلینەکەی د• ئەورەحمانەوە ) تەنیا دوو جۆر ئیدیەم لە یەکتر جیا بکەینەوە • جا ئەمە هەرچەند لە وردی کارەکە کەم دەکاتەوە لە سەرێکەوە ، بەڵام لە سەرێکیترەوە تووشی گیروگرفتی ئەوە نابین کە ئیدیەمێك سـەر بە دوو لایەن یان دوو جۆر بێت چونکە سنوری نێوان دوو جۆرە ئیدیەمەکە روونو ئاشکراو فراوانە •

لە لێکولینەوەکەیدا م• غازی لە هەردوو لایەنەکەی ئیدیەم فۆرمو واتا دەدویو هەوڵی ئەوە دەدات بیانبەستێتەوە بەیەکترەوە •

لێکولینەوەکە بەگشتی نـەك هـەر وردو قووڵو ڕەسـەنە بەڵکو بیرجووڵینیشە ، بە واتای ئەوەی دەیان پرسیار دێنێتە کایەوەو هـەوڵی وەڵامدانەوەیـان دەدات • لەزۆر ڕووەوە لەگەڵ بیروڕاکانی م• غـازی ڕێكدەکەوین ؛ وا لەخوارەوە تەنیا ئەو خاڵانە دەخەینە ڕوو کە بەلامانەوە دروست نین :

١ ــ م• غازی لە ڕووی فۆرمەوە ئیدیەم دەکات بە دوو بەشـەوە : ئەوانەی فۆرم دەگۆڕنو ( وەك لە سەربانێـکەوە فرێمبدەنـە خوارەوە ) ئەوانەی لەڕووی فۆرمەوە نەگۆڕن ( لە گوێی گادا نووسـتوە ! ) بەلای ئێمەوە ئەم دابەشکردنە دروست نییە چونکە هەموو ئیدیەمێ زۆرو کەم فۆرم دەگۆڕیو یەکێك لە تایبەتییەکانی ئیدیەم ئەوەیە کە فۆرمەکانیـان بەگشتی خەستبۆتەوەو ڕەق هەڵهاتووەو توانای گۆڕانیان کەمە ( بڕوانە بەشی سێ ، خاڵی دووەمی ئەم لێکولینەوەیە بۆ زانیاری زیاتر ) • جا تەنانەت ئەو ئیدیەمانەی کە م• غازی بە فۆرم گۆڕیان دادەنێ زۆر یاسای گۆرانکاری ڕەت دەکەنەوەو لەم ڕووەوە زۆر لە فریزی ئاسایی ( نەگیراو ) جیاوازن • بۆ سەلماندنی ئەم راستیە ، وا لەخوارەوە ئەو نموونەیە شیدەکەینەوە کە م• غازی لە سەرئیدیەمی فۆرمگۆڕ داوێتیو ئەو یاسـایانە دیاری دەکەین

کە ڕەتیاندەکاتەوە(٥٧) • هەرچەندە نموونەکە « وەك لە سەربانێکەوە فرێمبدەنە خوارەوە » ڕێگەی ئەوە دەدات ( وەك م• غازی دەریخستووە* ) کە بەرکارەکەی بگۆڕێ ، لە هەمان کاتیشدا ، چەندین یاسای گۆڕانکاری ڕەتدەکاتەوە وەك : ـــ

١ ـــ کاری ئیدیەمەکە نەفی ناکرێ(*) : وەك لەسەر بانێکەوە فرێمنەدەنە خوارێ •

٢ ـــ ئیدیەمەکە هەمووی ناکرێ بە پرسیار(*) ئایە وەك لە سەربانێکەوە فریمبدەنە خوارەوە وایە ؟

٣ ـــ پرسیار لە بەشێکی ناکرێ بێئەوەی واتاکەی بشێوێ : وەك لەکوێوە فرێمبدەنە خوارەوە ؟

٤ ـــ ڕێگای ئەوە نادات شوینەکە ( بناسرێ )(*) ، وەك لەسەر بانەکەوە فرێمبدەنە خوارەوە •

٥ ـــ ڕێگا نادات شوێنەکە لە شێوەی کۆدا بێ(*) : وەك لەسەربانانەوە فرێمبدەنە خوارەوە(*) • وەك لە سەربانەکانەوە فرێمبدەنە خوارەوە •

٦ ـــ ڕێگەی ئەوە نادات ( شوینەکە ) سەربانەکە پاشکەوێ(*) : وەك فڕێمبدەنە خوارەوە لە سەربانێکەوە •

٧ ـــ نابێت بە تەواوکەر بۆ کاریتر ( ناوەخن ناکرێ لەگەڵ ڕستەیتردا ) لێم پرسی وەك لە سەربانەوە فڕیدرابێتە خوارەوە(*) • ئەزانم وەك لە سەربانێکەوە فڕێدرابمە خوارەوە •

٨ ـــ ئیدیەمەکە ناچێتە شێوەی فرمانەوە(*) : وەك لە سەربانێکەوە فرێم مەدەرە خوارەوە(*) • فڕێیمەدەرە خوارەوە وەك لە سەربانێکەوە •

٩ ـــ کاتی کارەکە نابێ دیاریکرێ(*) : ئەمرۆ ( دوێنێ ) وەك لە

سەرباتێکەوە فرێیم بدەنە خوارەوە •

١٠ــ تافی کارەکە بە مەرجێك دەگۆڕێ ( بیری ئیلزامی ) تیـدا بمێنێ ، لەبەرئەمە کارەکە ناگۆرێ بۆ رابووردو ( رابورووی سادەو بەردەوام و تەواو )و ڕانەبوردووی سادە(*) : وەك لە سەرباتێکەوە فرێیان دابوومە خوارەوە • ئەو تێبینیانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەردەخـەن کـە دروست نی یە بەم ئیدیەمە بلێین « فۆرم گۆڕ » هەر لەبەرئەوەی کە دەتوانین بەرکارەکەی بگوڕین و هەندێ وشەی هاوواتا بخەینە جێگەی کەرتەکانی • هەروەها درووستیش نی یە بە ئیدیەمێکی وەك « لـە گوێی گادا نووستووە »(٥٨) ( نموونەکەی م• غازی لەسەر ئیدیەمی فۆرم نەگۆڕ ) بلێین فۆرم نەگۆڕ چونکە تەنانەت ئەم ئیدیەمەش وەك هەموو ئیدیەمێکی تر ڕێگا بە چەند یاسایەکی گۆڕانکاری دەدات کە بەسەریدا جێبەجێ بکرێ ، هەروەك چۆن ڕێگەش لە هەندێکی تر لەم یاسانە دەگرێ • بۆنموونە ، ئەم ئیدیەمە ڕێگەی ئەم یاسایانەی داوە :ــ

(١) دەکرێ بە تەواوکەر بۆ فرمانی تر ( دەچێتە نـاو رسـتەی ترەوە ) • وامزانی لـە گوێی گادا نووسـتووە • وا دەزانێ لە گوێی گادا نووستووم •

(٢) ڕێگەی ئەوە دەدات بکرێت بـە نەفی : خۆ من لـە گوێی گادا نەنووستووم ! هەروەها کە دەچێتە رستەی تریشەوە هەر دەکرێ بـە نەفی : چاك دەزانی من لە گوێی گادا نەنووستووم و نانووم •

(٣) کارەکە دەخرێتە هەندێ تافی ترەوە : خۆت دەزانی من لە گوێی گادا نانووم •

(٤) کاتی ڕووداوەکە دەتوانرێ بەهۆی ئاوەلـکارەوە دیـاری بکرێ : ئەوکاتەی تۆ باسی دەکەیت من لە گوێی گادا نووستبووم •
جارێکی تر من نابینی لە گوێی گادا بنووم •

ئەو ساڵە هەموو لە گوێی گادا نووستبووین •

(ە) وەك جۆری فۆرم گۆڕ ( بەپێی رای م• غـازی ) ڕێـگە دەدات ڕاناوەکەو کارەکەی بگۆڕێ بە ڕاناوو وشەی هاوواتای‌تر :
لە گوێی گادا نوستبووم / نووستبوین ، نوستبوون ••••
لە گوێی گادا خەوتووم ، خەوتوون •

کەواتە ، تاکە جیاوازی نێوان ئـەم دوو ئیدیەمە لـەوەدا نی‌یە کـە یەکێکیان فۆرم‌گۆڕو ئەویتریان فۆڕم‌نەگۆڕە ؛ بەڵکو لەوەدایە کە هەریەکەیان ڕێگە بە جۆرێك یاسای گۆڕانکاری دەدات‌و ڕێگە لە جورێکی‌تر دەگرێت • لەبەرئەمە پێوانەیەکی ڕاست‌و درووستمان دەست‌ناکەوێ بۆ جیاکردنەوەو ترازاندنیان لە یەکتری بەپێی فۆرم •

٢ ــ ئاشکراو بەڵگە نەویستە کە زۆر زمان ئیدمی هاوبەشیان هەیە ، بە واتای ئەوەی کە هەندێ ئیدیەم بەهەمان فۆرم‌و واتا لە دوو زمان یـان زیاتردا دەبینرێن • م• غازی بۆ ئەم ڕاستیە چووە بەڵام ئەو چەند ئیدیەمەی کەبەرامبەر یەکتری لە کوردی‌و ئینگلیزی‌دا دایناون زوربەیان تـەنیـا لەفۆرمدا لە یەکتر دەچن‌و لەواتادا تەواو جیاوازن • بە واتایەکی‌تر ، ئـەم نموونانەی م• غازی تەنیا لە روخسار یان ڕەواڵەتدا لە یەکتر دەچن ، بەڵام لەژێرەوە تەواو جیاوازن وەك بەوردی لەخوارترەوە دەری‌دەخەین(٥٩) :

ا ــ گوێ دان = Lend me your ears

« گوێ‌دان » لە کوردیدا بە واتای « گرنگی پێدان » یان « نەخستنە پشت گوێ » دێت • ئیدیەمە ئینگلیزیەکە بە واتای « گوێم لێ ڕاگرە » یان « گوێم لێ بگرە » دێت ، دەربڕە ئینگلیزیەکە زۆر ئەدەبی‌یەو لە ئینگلیزی ڕۆژانەدا بەکارنایەت : بە پیچەوانەشەوە « گوێ‌بگرە »ی کوردی زۆر بڵاوە •

ب ــ دەستشۆردن = wash one's hands of

ئەم دووانە دیسانەوە لە واتادا وەك یەكتر نین • لە كوردیدا كە دەست لە یەكێك یان لە كارێك « دەشۆین » ئومێدمان پێی نامێنێو بەتەمای خێر نین لێی بوەشێتەوە و بێتەدی ، بەپێچەوانەوە ، كە لە ئینگلیزیدا دەست لە كەسێك یان كارێك « دەشۆین » پەیوەندیمان بە كەسەكە یان كارەكەوە نامێنێتو لێپرسراو نابین بەرامبەر هەر هەڵەو گۆتاوڕۆیەك كارەكە هەیبێ یان هەر كێشەیەك كەسەكە تووشی بێت ــ كەواتە ئیدیەمەكە زیاتر لە كوردیدا بەرامبەر « هەقم بەسەریەوە نییە » دەوەستێ •

ج ــ بە دەستی ئەوە = on one's own hand

دیسانەوە ئەم دووانە بەرامبەر یەكتر ناوەستن لە ڕووی واتاوە ؛ ئیدیەمە ئینگلیزییەكە بەواتای « هی خۆی » یان « ئەو دەبێ پێی هەستێ ( بەكارێك ) » دێتو یەكێكە لەو ئیدیەمە یەكگرتووانە كە گرانە وەربگێڕێنە سەر زمانیتر • ( بڕوانە كۆتایی بەشی پێنجەمی ئەم لیكوڵینەوەیە ) •

٣ ــ دەستی پاكە = have clean hands

ئەم دووانەش كتومت واتایان لە كوردیو ئینگلیزیدا وەك یەك نییە چونكە دەستپاكی لە كوردیدا بە واتای سەر راستیو دزی نەكردن دێت • هەرچی ئیدیەمە ئینگلیزییەكەیە بە واتای « بێ تاوان » یان « بێگوناح » دێو ئەم دوو شتەش لە یەكترەوە دوورن چونكە كەسێك دەتوانێ بێ گوناح یان بێ تاوان بێ ( پیاوكوژ نەبێ ) بەڵام لە هەمان كاتیشدا دەستپاك نەبێ ( بدزێ ) • كەواتە ئیدیەمە ئینگلیزییەكە پەیوەندی بە «پیاوكوشتن»ەوە هەیە ، كوردیەكەش بە ڕەوشتی كەسێكەوە •

٣ ــ م• غازی لەو باوەڕەدایە كە ئیدیەم لەگەڵ ڕستەی فرەواتادا نابێ تێكەڵ بكرێو ئەو ڕستانەی كە دوو واتا دەبەخشن « ئەبێ لە ڕووی

سینتاکس‌و سیمانتیکه‌وه لێك‌بدرێنه‌وه »*(٦٠) • هه‌رچه‌نده لێره‌دا تـــه‌م‌و مژێك له بیره‌كاندا هه‌یـــه‌و م• غازی راكه‌ی خۆی به زه‌قی‌و به‌ئاشـــكرا نه‌دركاندووه ، واتێ ده‌گه‌م م• غازی ده‌یه‌وێ بڵێ « سك‌سووتان » به واتای « منال مردن » جیاوازه‌و په‌یوه‌ندی به « سك‌سووتان » به واتا پیتیه‌كه‌یه‌وه نی‌یه • به باوه‌ڕی من ئه‌م دوو شته هه‌ر یه‌كێكن « سك‌سووتان » به واتای « منال مردن » یان « جه‌رگ سووتان » وه‌ك دركه‌یه له‌جیاتی كه‌سێكی زۆر خۆشه‌ویست ( كه به‌شێك بێت له ئافره‌ته‌كه ) به‌كارهاتووه‌و « سووتانیش » به واتای خوازراوی « مردن / له‌ناوچوون » دێت • زوربه‌ی ئیدیه‌م ئـــه‌م دوو واتایه‌ی هه‌یه ، هه‌رچه‌نده ئیدیه‌م به واتا خوازراوه‌كه‌ی زۆر بلاوتر به‌كاردێ ( بڕوانه به‌شی ٣ ــ ٣و به‌شی چوار بۆ لێكدانه‌وه‌ی ئه‌م باوه‌ڕه به‌درێژی ) • به باوه‌ڕی ئێمه ئیدیه‌مێكی وه‌ك « كاسه لێس » له ڕسته‌یه‌كی وه‌ك « ئه‌وكه‌سه‌ی كاسه ده‌لێسێته‌وه وه‌رده‌گیرێ‌و ئه‌م ڕۆنانه ژێری‌یه دوو ڕۆنانی سه‌ره‌وه‌مان ده‌داتێ (١) واتای پیتی وشه‌كانه (٢) واتایه‌كی خوازراو ( كه‌سێكی سووك ) واتای دووه‌م له واتای یه‌كه‌مه‌وه به‌هۆی چه‌ند یاسایه‌كی واتا گۆڕه‌وه دێته‌كایه‌وه • هه‌رچه‌نده تا ئێستا بیرمان له هه‌لكه‌وت‌و چۆنیه‌تی ئه‌م یاسا واتاگۆڕانه نه‌كردۆته‌وه ، بـــه‌لام ( بڕوانـــه به‌شی شـــه‌شی ئـــه‌م لێكۆلینه‌وه‌یه ) دلنیاین كه ده‌بێ له‌وجۆرانه بێ كه خوازه‌و دركه‌و موباله‌غه‌و پۆشینی زمانی ( نه‌ك ئه‌ده‌بی ) ڕه‌چاو بكات • ته‌نانه‌ت بۆ ئه‌و ئیدیه‌مانه‌ش كه ئێسته ته‌نیا واتا خوازراوه‌كه‌یان ماوه‌ته‌وه‌و واتـــا بنه‌ڕه‌تیه پیتی‌یه‌كه‌یان له‌ناوچووه ( وه‌ك گونكی سه‌ردل ، دلته‌ڕ ، ڕه‌زاگران ، ده‌ستڕۆییو ••• هتد ) ده‌بێ به باوه‌ڕی ئێمه ڕۆنانێكی ژێره‌وه‌ی بۆ دابنێین كه كت‌ومت واتا پیتی‌یه‌كه‌یان بێت هه‌رچه‌نده ئه‌مانه له زمانه‌كه‌شدا نه‌مابن • شایانی تێبینی‌یه كه تیاچوونی واتا بنه‌ڕه‌تی‌یه پیتی‌یه‌كه په‌یوه‌ندی له‌گه‌ل پله‌ی ئیدیه‌مایه‌تی‌و جۆری ئیده‌یه‌مه‌كه‌دا ( یه‌كگرتوو ولێكدراو ) هه‌یه : ئیدیه‌می پله یـــه‌ك یان

یەکگرتوو ئەوانەن کە واتا بنەڕەتیەکان لەناوچووە • ئیدیەمی پلە دوو یان لێکدراو ئەوانەن کە هەردوو واتاکانیـــان مـــاوەو قســـەکەر یان گوێگر ئاگاداری ئەم راستیەن‌و زۆر جار کەلکی لێ وەردەگرن نەك بۆ تێ‌گەیاندن بەلکو بۆ گالتەوگەپ ( بڕوانە بەشی ٣٠٣ ) •

٤ ــ م• غازی لە پۆلێن‌کردنی ئیدیەمەکاندا بەپێی فۆرم ( ڕۆنـــان ) کەوتۆتە گێژاوەوە چونکە نەی‌توانیوە بەپێی ئەو بنەما بێ‌هێزەی کە دایناوە بۆ خۆی جۆرەکانی ئیدیەم ( ناوی‌و ئاوەلناوی وفرمانی ) بەتەواوی لـــە یەکتری بترازێنێ‌و جیایان بکاتەوە • هۆی سەرەکی ئەم گێژاوەش لەوەدایە کە پێوانەکەی م• غازی تەم‌ومژێکی زۆری پێوە نیشتووەو مەبەستەکەی ئاشکرا نی‌یە • بۆ نموونە ، کە دەلێ « بە ئیدیەمێك ئەتوانرێ بووترێت ئاوەلناوی ئەگەر ئاوەلناوێکی تێدا زال بێ ویان فرمانی ئەگەر فرمانێکی تێدا زال بێ »[٦١] دەبوایە « زال » بوونی تەواو روون‌بکردایەتەوە چونکە زیاتر لە واتایەکی هەیەو هەموو پۆلێن کردنەکەش بەم بنەمایەوە بەندکراوە • بەلای منەوە بێ هێزی بنەماکە وای لە م• غازی کردووە ئیدیەمی :

١٧ ــ لەشی سووکە •

١٨ ــ لەشی گرانـــە •

بە ئاوەلناوی دابنێ ، لەکاتێکدا کە ئەمانە لەبەرئەوەی « کاریـــان » تێدایە هەر دەبێ کاری بن ، چونکە هیچ ئاوەلناوێك بـــە تەنیا جێگەیـــان ناگرێتەوە :

لەشی سووکە ✱ ئازا •

لەشی گرانـــە ✱ تەمەل •

جگە لەمەش ، ئەمانە کاتێك دەبنە ئاوەلناوی کە لە یەکتر نەترازێن :

لەش سووك ← کورێکی لەش سووکە •

لەش گران ← کیژێکی لەش گرانە •

لێرەدا ، لەبەر ئەوەی « ئاوەڵناون » دەتوانین ئاوەڵناوێ لە جێگەیان دائێین ، بەڵام دیسان ئەمانە هەر کاری « کارەکە » ناکەن •

لەش سووك = ئازا •

لەش گران = تەمەڵ

کوڕێکی لەش سووکە = کوڕێکی ئازایە •

کوڕێکی لەش گران بوو = کیژێکی ( تەمەڵ ) بوو •

هەروەها م• غازی ڕوونی نەکردۆتەوە لەبەرچی ئیدیەمی :

٢٣ ــ دڵیان بە یەکەوەیە •

ی بە ئیدیەمێکی ناوی داناوە • دیسانەوە لەبەر ئەوەی ئیدیەمەکە کاری تێدایە ( ە ) ، هیچ ناوێ بە تەنیا ناتوانێ جێــگەی بگرێتەوە • خۆ ئەگەر م• غازی لە وانەش بێ کە ( ــ م ، ــ ن ، ــ بت ، ••• هتد ) بە « کار » دانەنێ ، ئەوا هەر دەبوایە تێبینی ئەوەی بکردایــە کە ئیدیەمەکە لە بەشی « گوزارە » Predicete دا دێ لە ڕستەداو بەشی گوزارەش بە لایەنی کەمەوە دەبێ کار ــ ئاســا بێ وەك بــەم تاقیــکردنەوانــەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

(١) ئەم کوڕو کچە دڵیان بەیەکەوەیە •

(٢) * ئەم کوڕو کچە هاورێ •

( ئەگەر ئیدیەمەکە ناوی بوایە دەبوو « هاورێ » جێگەی بگرتایەوە • )

(٣) ئەم کورو کچە بوون •

( کارەکە « بوون » دەتوانی جێگەی ئیدمەکە هەمووی بگرێتەوە •

کەواتە ئیدیەمەکە « کار ـ ئاسا »یە ) •

(٤) ئەم کوڕو کچە دەڕۆن •

( دیسانەوە کارێکی تەواویش دەتوانێ ئەرکی ئیدیـەمەکە هەمووی ببینێ ) •

(٥) ئەم کوڕو کچە هاوڕێن •

( لێرەدا ناوێك و کارێك جێگەی ئیدیەمەکەیان گرتۆتەوە • لەبەرئەوەی ناوەکە بەتەنیا ناتوانێ ئەم کارە بکات ( بڕوانە رستەی دوەم لەسەرەوە ) ، بەلاَم کارێك بە تەنیا دەتوانێ ( بڕوانە رستەی ٣ و ٤ لە سـەروترەوە ) کەواتە ئیدیەمەکە کار ـ ئاسایە نەك ناوی ) •

**پەراوێزەکان :**


(١)
Trivedi, R. D. (1977) English Grammar, Vikas Publishing House, New Delhi, Part II, P. 44.

(٢) هەمان سەرچاوە ل. ٤٥ .

(٣)
Meetham, A. R. (ed) 1974, Encyclopaedia of Linguistics, Informational Control, Pergammon Press, P. 667.

(٤)
Pyles / Algeo, 1979, English Harcourt Brace, P. 10 I.

(٥)
Bolinger, D. ( 1972 ) Regarding Language, Harcourt Brace, New York pp. 52 - 53.

(٦) هەمان سەرچاوە ل. ٦٨ .

(٧)
Kooij, J. G. (1968) "Compounds and Idioms" , Lingua 2 I , pp. 250 - 268.

(٨)
Bolinger, pp. 67 - 68.

(٩) هەمان سەرچاوە .

(١٠)
Arnold, I. V. (1973) the English Word, Mir Publishing House, Moscow, pp. 67 - 73.

(١١) بڕوانە Pyles / Algeo p. 10 I.

(١٢) بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین وشە دەبێ دووپات ببێتەوە هەرچەندە کەرتەکانی ئیدیەم مەرج نی‌یە سەربەخۆ بە هەمان واتا دووپات ببنەوە تەنانەت ئەگەر وشەش بن . بۆنموونە ، کەرتی دوەم لە ئیدیەمی « قسەو مسە »دا بەو واتایەی هەیەتی تەنیا لەم ئیدیەمەدا دەبینرێ‌و هەرچەندە وشەشە جارێکی‌تر لە زمانەکەدا دووپات نەبۆتەوە .

(١٣)
Meys, W. J. (1974) Compound Adjectives in English and the Ideal speaker — Listener, North Hollands, Amsterdam, p. 3.

(١٤)
Ullmann, S. (1957) Principles of Semantics 2nd edition, Glasgow, Jackson, Oxford Blackwell.

(١٥) Kooij, p. 245.

(١٦)
Langacker, R. W. ( 1967 ) Language and Its Structure 2and edition, Harcourt Brace, pp. 127 - 136.

(١٧) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی سەرکەشی ئیدیەم‌و خۆنەدانی بە دەست هەندێ دەستووری ڕێزمانەوە بڕوانە پێشەکی . . .

Cowie / Mackin (1957). Oxford Dictionary of Current Idiomatic English, V1. I, Oxford.

(١٨) بڕوانە لێکولینەوەکەی م. غازی وەیس کە بە پیچەوانەی ئەم ڕایەوە دوو جۆر ئیدیەم لە یەکتری جیادەکاتەوە ؛ ئیدیەمی فۆرم گۆڕو ئیدیەمی فۆرم نەگۆڕ . ( ئوتونۆمی ، ژمارە ٤ ، ساڵی حەوتەم ؛ ل ٥٩ ــ ٦٤ ) .

(١٩)
Francis, W. N. (1973) the English Language, Norton and Company, New York, p. 117 - 119.

(٢٠) ئەم نموونەیە یەکێکە لە دەیان ئیدیەم کە تەنیا ئافرەت لە زاری سلێمانیدا بەکاریان دێنێ .

(٢١) بڕوانە Ullmann, p. 34.

(٢٢) بۆ نموونە ، ئیدیەمیکی وەك "run down" لە رستەیەکی وەك "He can run down himself" دوو واتا دەدات بە دەستەوە بە پێی باری قسە : (١) ئەو خۆی دەتوانێ بڕوات (٢) ئەو خۆی دەتوانێ بکات بە ژیرەوە ( بەژێر سەیارە ؛ عەرەبانە ... هتد ) . قسەکەر دەتوانێ یاری بەم دوو واتایە بکاتو بۆ گاڵتە بەکاری بێنێ .

(٢٣) بڕوانە Arnold, p. 155.

(٢٤) بڕوانە Kooij, J. p. 252. لێرەدا نووسەر ، نەك هەر دوو پلە ئیدیەم بەڵکو چەند پلەیەك ئیدیەم لە یەکتری جیا دەکاتەوەو نموونەیان لە ئینگلیزیدا بۆ دەهێنێتەوە . بە ڕای ئەم ئیدیەمێکی وەك "sweet meat" یار ، پلەیەکی زیاترە لە "sweet heart / ( حەڵوا ) ، هەروەها ئەمەش پلەیەك لە سەروو "sweet corn" وەیە .

(٢٥) هەمان سەرچاوە ل. ٢٥٠ .

(٢٦) هەموو زمانەوانە تەرکیبیەکان بە تایبەتی ئەمریکاییەکان باوەڕیان وابوو کە لە قۆناغی ئیستای زمانەوانیدا ( تاساڵەکانی پەنجا )و بەهۆی ئەو تەکنیکانەی کە لە بەردەستدایە واتا شیناکرێتەوە . لەبەرئەوە زۆربەی زۆریان ، جگە لە ( Pike ) واتایان دەخستە پشتگوێ .

(٢٧) فریزی ئاسایی لە کوردیدا لە قالبێکیوادا دەبێ :

ناو + و + ناو یان ( ئاوەڵناو )
ە
ی

وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ : کاڵەکو شووتی ؛ شەقامی کاوە ؛ سەعات چوار ، ئەم پیاوە ئازایە ....

(٢٨) جۆرێکیتر لە ئیدیەمی ناو ـ ئاسا لە دوو ناو پێكدێت کە دووەمیان لەسەر وەزنی یەکەم داڕێژاوە وەك « قسەو مسە »و کاڵەکو ماڵەك .

به پێچەوانەی ڕایەهەندی کوردەوانەوە ، ئەم جۆرە فریزەم لێرەدا بــە
به ئیدیەم نەداوەتە قەڵەم (بڕوانە د. ئەورەحمانی حاجی مارف) لەبەر دوو
هۆ (١) لە رووی واتاوە ئەم فریزانە ئەو بێ هاوتایی‌یەیان تێدا نی‌یە کە بە
گشتی لە ئیدیەمدا هەیە ، بە واتــای ئــەوەی واتاکەیان لە ســەرجەمی
واتای پارچەکانەوە نەهاتووە ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ، هەموو واتاکە لە
کەرتی یەکەمدا کۆبۆتەوە (٢) ئەم شێوە فریزە ، بەپێچەوانەی ئیدیەمەوە
کە نەگۆڕو چەسپاوو ڕەق هەڵهاتووە ، بەردەوام لە زمانەکەدا بەکاردێ‌و
فریزی نوێی لەسەر دادەڕێژرێ ( وەك فیدێوو میدیۆ ، غەسالەو مەساله
. . . هتد ) .

(٢٩) دیسانەوە ئەمەش لە ڕۆناندا دەچێتەوە سەر ڕۆنانی ئاوەڵکاری لێکدراوی
ئاسایی وەك « شلپ‌و هووڕ »و « تەپ‌و کوت »و . . . هتد .

(٣٠) زۆربەی ئەمانەش لە ڕۆناندا دەچنەوە سەر ڕۆنانی ئاوەڵکاری لێکدراوی
ئاسایی وەك : خان‌ومان ، باڵابەرز ، کلك‌و گوێ‌کراو ، لێو داقلێشــاوە
. . . . هتد .

(٣١) ئەو ئیدیەمانەی کاری « بوون » یان تێدایە کۆمەڵێکی گەورەن‌و نموونــە
لەسەریان زۆرە وەك : ڕیوی دەرەوە ، شێری ماڵەوە ؛ زمانی لە دەمدا
نی‌یە ، پشتی قایمە ، زۆری تێ‌گوشیوە ، بەدنمەکە . . . . هتد .

(٣٢) هەندێ نووسەریش بەپێی تیپی ئەبجەدی لە ئیدیەمەکان دەدوێن وەك
زۆربەی ئەو کارانەی دەربــارەی ئیدیــەمی عەرەبی کراوەو هەروەهــا
کارەکەی م. جلال مەحمود علی لە کوردیدا .

(٣٣) بڕوانە Arnold, p. 154.

(٣٤) هەمان سەرچاوە ، پۆلێنەکەی ڤینوگرادۆف ل ١٥٥ .

(٣٥) هەمان سەرچاوە ل. ١٥٦ .

(٣٦) بڕوانە Ullmann, p.

(٣٧) بە باوەڕی من بەپێی ئەو بنەمایانەی کە ڤینوگرادۆف داوێتی زۆر بــە
گران جۆری یەکەم‌و دوەم لە یەکتری جیادەکرێنەوە . لەبەرئەمە نموونەم
لە کوردیدا بۆ کۆمەڵی دوەم ( ئیدیەمی یەکگرتوو ) نەهێناوەتەوە . بڕوانە
خوارتر بۆ نرخاندنێکی ئەم پۆلێنە بە گشتی .

(٣٨)
Viktor, V. L. "Semantic word structure and Extra Linguistic Factors" , in Soviet Studies in Language and Language behaviour, 1975, North — Holland, Amsterdam, p. 126.

(٣٩)
Leech, G. N. (1968) A Linguistic Guide to English Poetry, Longman, London, pp. 147 - 178.

(٤٠) هەمان سەرچاوە .

(٤١)
Leech. G. N. "Linguistics and the Figures of speech" in Essays on style and Language, (ed) Fowler R. (1975) Routledge and Kegan, pp. 135 - 156.

(٤٢) Pyles / Algeo pp. 225.

(٤٣) بڕوانە Leech, 1968 p. 152.

(٤٤) Leech, 1975 p. 140.

(٤٥) Leech, 1968, pp. 162 - 170.

(٤٦) هەمان سەرچاوە .

(٤٧) بڕوانە Pyles / Algeo p. 201.

(٤٨) Arnold p. 152.

(٤٩) بۆ زیاتر روونکردنەوەی کارو ئەرکی یاسای واتاگۆڕ وا لەخوارەوە بەدرێژی پێشانی دەدەین چۆن ئیدیەمی « پەردەیەکی پیادا دە » لە فریزی ئاسایی « پەردە دادانەوە »وە وەردەگیرێ بە هۆی یاسای واتا گۆڕەوە کە ئەرکی گۆرینی هەندێ تایبەتی « پەردە » دەگرێتە ئەستۆ . شایانی باسە کە ئەم یاسایانە دەبێ ئارەزوومەندانە بەکار بێ وبەسەر ئەو رۆنانەدا جێ بەجێ بکرێ کە دەچێت بۆ بەشی فۆنولوجی . بۆ دەرهێنانی رستەی « ژنەکە پەردەیەکی بە پەنجەرەکەدا دا » پێویستمان بە چەند یاسایەکی دەرهێنانە ( وەك رستە بریتی‌یە لە فریزی کاری‌و فریزی ناوی ؛ فریزی ناو پێكهاتووە لەناو لەگەڵ نیشانەی ناسین‌دا .... هتد ) کە دەتوانین بەهۆی ئەم دایەگرامەی خوارەوە پیشانی بدەین .



\+ کەرەسە

فریز مارکەری ژێرەوە + کەلەبەر

\+ پۆشین

← یاسای واتا گۆڕ + پۆشین

لەدوای بەجێ هێنانی یاساکانی بەشی فۆنۆلوجی ، ڕۆنانی سەرەوە دەبێ بە : ژنەکە پەردەیەکی پێدادا .

یاسای واتا گۆڕ کاتێ جێ بەجێ دەکرێ کە « پەنجەرەکە » ببێتە ناوێکی نابەرجەستە وەك « کێشەکە ، مەسەلەکە ..... »

(٥٠) بڕوانە : جەلال ئەمین مەحمود ، ئیدیەم لە زمانی کوردیدا ، ١٩٨٢ بەغداد کە کارێکە لەم بابەتەو زۆربەی نموونەکانی ئەم لێکۆڵینەوەی لێوە وەرگیراوە .

(٥١) بڕوانە :

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ١٩٧٥ ، بەغداد .

(٢) « کاریکی گەورە لە باسی ئیدیەم لە زمانو فەرهەنگ نووسی کوردیدا » ، حوزیرانی ١٩٨٠ ، بەیان ، ژمارە ٦٣ ل. ١ ــ ٦ .

(٥٢) غازی فاتح وەیس « فۆرمو ناوەرۆکی ئیدیەم » ، ئوتونۆمی ، ژمارە ٤ ، ساڵی حەوتەم ، ل ٥٩ ــ ٦٤ .

(٥٣) Arnold p. 155.

(٥٤) بڕوانە د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ١٩٧٥ ل ٦١ ــ ٦٦ .

(٥٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٦٤ نموونەکەش لێرەوە وەرگیراوە .

(٥٦) لێکدانەوەیەکی ئەم ئیدیەمانە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە « دەستە ئەژنۆ » لە « دەست لەسەر ئەژنۆوە » وەرگیراوە . هەروەها لە « کەوڵە کۆن » دا « کەوڵ » بەواتای « کەس » دێ . دیسانەوە « کا » لە « کای کۆن » دا بە واتای « شەڕ » یان « ئاشووبە » دێت .

(٥٧) غازی فاتح وەیس ل ٦٠ .

(٥٨) هەمان سەرچاوە ل ٦١ .

(٥٩) هەمان سەرچاوە ل ٦١ .

(٦٠) هەمان سەرچاوە ل ٦٢ .

(٦١) هەمان سەرچاوە ل ٦١ .

### ملخص البحث

## الكنـــاية الكرديــة

**محمد معروف فتاح**
اربيل ــ جامعة صلاح الدين

بالرغم من أن الكناية الكردية قد حظيت باهتمام أكبر من غيرهـــا من المواضيع اللغوية من لدن الكتاب واللغويين الاكراد والاجانب ، الا ان هذا الاهتمام كان ومايزال منصباً على محاولة جمع الكنايات وتفسيرها دون التطرق الى تصنيفها وطرق اشتقاقها • كما أن اللفظة نفسها مازالت تكتنفها كثير من الغموض •

يحاول الباحث في مقدمة البحث تعريف اللفظة وتحديد مفهومها وتمييز الكناية عن الكلمة المركبة والعبارة ويعتبر الكناية احدى وحدات المســتوى الدلالي للغة تأخذ تارة شكل كلمة مركبة أو عبارة وتظهر تارة أخرى على شكل جملة أو شبه جملة • ان الكناية كأي مركب كيمياوي كل" أكبر من

الاجزاء من ناحية المعنى ولا يمكن التنبؤ بالخصوصية الدلالية لهذا الكل الا من خلال تحليل لغوي دقيق للأجزاء المكوّنة لها .

ثم يُضيف الباحث الكناية الكردية وفق الشكل والمضمون ويميز درجتين من الكناية من ناحية المعنى (١) الكناية المزيجة التي لا يمكن التنبؤ بمعناها و (٢) الكناية المركبة التي يحتفظ أحد أجزائها بقسط كبير من معناه الأصلي .

ويربط الباحث في القسم الأخير من البحث بين المضمون اللفظي والمضمون المجازي للكنايات ويؤكد أن المضمون المجازي يقتبس أو يشتق من المضمون اللفظي ( كما في استعمال التحويليين للاشتقاق ) باستعمال قواعد أو قوانين معينة ومحددة يحاول الباحث صياغة نماذج منها لتطبيقها على المضمون اللفظي لنقله الى المضمون المجازي .

ويحاول الباحث في ملحق البحث تقييم عدد من المقالات والبحوث عن الكناية الكردية ويركز على بحوث كل من الدكتور عبدالرحمن معروف والسيد غازي فاتح ويس محاولاً اظهار مواطن القوة والضعف فيها . ويؤكد الباحث على أن هذه البحوث خلافاً لغيرها من الدراسات وعلى الرغم من تحاشيها لبعض الجوانب النظرية للظاهرة وبالرغم من عدم اتفاق الباحث مع بعض الآراء التي ترد فيها ، بحوث جيدة تحفز على التفكير وتثير تساؤلات يمكن أن تمهد الطريق الى دراسة أشمل وأعمق لهذه الظاهرة اللغوية .

★ ★ ★